ڕۆمان

د. نەوال ئەلسەعداوی

# ئافرەتێك لە خاڵی سفردا

وەرگیڕانی لە عەرەبییەوە
حیڤارا کەمال



ڕۆمان

# ئافرەتێک لـە خاڵی سفردا

نەوال سـەعداوی                    جیڤارا کەمال

ئەم ئافرەتە ڕاستەقینەیە لە گۆشت و خوین ، لە بەندیخانەی ( قەناتر ) چەند یتێک لەمەوبەر بە دیداری شادبووم . ئەوکات من سەرقاڵی لێکۆڵینەوەیەک بووم لەسەر کەسیتی هەندێک لەو ئافرەتانەی کە تاوانبارکراون و زیندانیکراون لە کیشەی جۆرا و جۆردا .
پزیشکی بەندیخانەکە پێی وتم : کە ئەم ئافرەتە سزای لەسێدارەدانی بەسەردا دراوە لەبەرئەوەی پیاوێکی کوشتووە ، بەڵام ئەم ئافرەتە لە ئافرەتە بکوژەکانی ناوەوە و دەرەوەی بەندیخانەکە ناکات چونکە کەسیتیەکی جیاوازە . هەموو جۆرە چاوپێکەوتنیك ڕەتدەکاتەوە ، وەڵامی هیچ کەسێکیش نەداتەوە ، زۆر بە کەمیش نەیێت خواردن ناخوات ، لەبەرەبەیانیشدا نەیێت خەوی لێناکەویت . ئەو پۆلیسە ئافرەتەی لێرەیە و چاودیری بەندکراوەکان دەکات دەڵێت : زۆرجار ئەبینیت ئەم ئافرەتە لە گۆشەیەکدا بە تەنیا دانیشتووە و چەندین کاتژمێر داڵغە دەیباتەوە ڕۆژیکیان داوای کاغەز و قەڵەمیکی کردووە و ماوەیەکی زۆر خۆیداوە بەسەر کاغەزەکەدا پۆلیسە ئافرەتەکەش نەیتوانیوە بزانیت ئایا نامە ئەنوسیت بۆ کەسێک یاخود هیچی نوسیووە.
لە پزیشکی بەندیخانەکەم پرسی : ئایا ئامادەیە چاوی بە من بکەوێت ؟
وتی : هەوڵ دەدەم قایلی بکەم کەمێک لەگەڵتدا دابنیشێت لەوانەشە قایل نەیێت گەر بزانیت پزیشکی دەرونیت و لێکۆڵەری دادگا نیت . چونکە وەڵامدانەوەی هەموو پرسیاریك ڕەتدەکاتەوە ، تەنانەت ئیمزاکردنی داوایەکی بەرزکراوەی بۆ سەرۆکی دەوڵەت رەتکردەوە کە بە مەبەستی

کەمکردنەوەی سزاکەی بوو لە لەسێدارەدانەوە بۆ زیندانی هەتایی .
لێم پرسی : ئەی کی ئەم داوایەی بۆ نوسی ؟
وتی : من بۆم نوسی ، لەبەرئەوەی لە ڕاستیدا من هەست ناکەم بکوژ بیت . گەر سەرنجیکی روخسار و چاوەکانی بدەیت بۆت دەردەکەویت کە مەحاڵە ئەم ئافرەتە ناسکە بکوژبیت .
لێم پرسی : ئەی کی وتویەتی کرداری کوشتن پێویستی بە ناسکی نیە؟
بە تێڕوانینیکی سەرسورمانەوە لێم وورد بوەوە و پێکەنینیکی کورتی تورەی کردوو وتی : تۆ کەست کوشتووە ؟
وتم : ئایا من ئافرەتێکی ناسکم ؟!
رویکرد بەولاوە و پەنجەرەیەکی بچووکی پێشاندام و وتی : ئەوە ژورەکەیەتی ، ئێستا ئەچم تا قایلی بکەم بیتە خوارەوە بۆلات .
پزیشکی بەندیخانەکە پاش کەمێک بە تەنها گەڕایەوە ( فردۆس ) چاوپێکەوتنمی رەتکردبوەوە .
وا پێویست بوو ئەو ڕۆژە چەند نەخۆشیکی دەروونی بەندکراو ببینم و بیانپشکنم ، بەڵام سواری ئوتومبیلە بچکۆلانەکەم بووم و بەندیخانەم جێهێشت .
لە ماڵەوە نەمدەتوانی هیچ شتێک بکەم . و چاو بگێڕمەوە بە رەشنوسی دوا کتێبمدا ، وەلێ بیرم توانای جێگیربوونی لەسەر هیچ شتێک نەبوو هەر لای ئەو ئافرەتە بەندکراوە بوو

کە ( فردۆس ) ی ناو بـوو و بریـارە دوای ( 10 ) ڕۆژیتـر سـزای لەسێدارەدانی بەسەردا جیبەجی بکریت .
بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر چـومەوە بەنـدیخانە . هێشـتا پزیشـکی بەنـدیخانەکە نەهـاتبوو ، منـیش داوام لە پۆلیسـە ئـافرەتەکە کرد چاوم بکەوێت بە ( فردۆس ) .
بەڵام پۆلیسـەکە پێـی وتـم : بـی سـوودە دکتـۆرە . مەحـاڵە چاوی پیت بکەوێت .
لێم پرسـی : بۆچی ؟
وتی : پاش چەند ڕۆژیکی دیکە لە سێدارەی دەدەن ، ئیتر ئایـا ئەبیت چی بویت لە تۆ و خەڵکی تریش ؟ .. لێی گەڕین !
زمانی ئاخاوتنی پۆلیسەکە لەگەڵم بیسەرە و بەرە و تورە بـوو بە دوو چـاوی تیـژەوە لێـی ئەروانـیم وەك ئەوەی مـن لە سێدارەی بدەم .
بە پۆلیسـەکەم وت : مـن لە بەرپرسـانی نـاوەوە و دەرەوەی بەندیخانە نیم .
بە تورەییەوە وتی : هەموویان وا دەڵێن .
لێم پرسـی : بۆچی وا تورەیت ؟ هەست دەکەیت ( فـردۆس ) بیتاوان بیت و کەسی نەکوشتبیت ؟ ..
بە تورەییەکی ڕەقترەوە وتـی : کوشـتبیتی یـان نەیکوشـتبی ئەو بیتـاوانە ، نابیـت لەسـێدارە بـدریت . ئەوەی پێویسـتە لەسێدارە بدریت ئەوانن .
لێم پرسـی : ئەوان کین ؟
بە گومانیکەوە لێی روانیم و وتی : تۆ کییت .. ؟ ئایـا ( ئەوان ) تۆیان بۆ ناردووە..؟
جاریکی تر لێم پرسـی : ئەوان کین ؟

بە وریــایەوە بەمــلاولای خۆیــدا روانیــی و لــێم دورکەوتەوە و پاشان لەبەرخۆیەوە ئەیوت : ئەوان ! نایانناسی ..؟
وتم : نەخیر .
پێکەنینیکی گاڵتەجارانەی کردوو جێی هیشتم .. گوێم لێ بوو ئەیووت : چۆن نایانناسی هەموو خەڵکی ئەیانناسیت ..؟
پاشــان ســەردانەکانم بــۆ بەنــدیخانە پەرە پێــدا ، لەهەمــوو سەردانیکیشدا هەوڵمدەدا فردۆس ببینم ، بەڵام سەرجەم هەوڵەکــانم شکســتی دەهێنــا . وایلێهــات ئەو لێکــۆڵینەوە دەرونــیەی ئەنجــامم دابــوو خەریکبــوو لەبــار دەچــوو ، بەڵکــو لەبەرچاومــدا ژیــانمم بە شکســت خــواردویی یــا شکســت هەرەشەی لێبکات ئەهاتە پێش چاو . هەستمکرد متمانەم بەخــۆم جۆریــك لە لەقــین و کەلێنــی تێکەوتــووە لەچەنــد چرکەیەکی سەختدا بەبیرمدا هات کە ئەم ئافرەتە بکوژەی پاش چەند ڕۆژیکی دیکە خۆشی دەکوژریت لە من باشترە ، مــن لەچــاو ئەودا وەك میروولەیەکــی بچــووك وام کە بەســەر زەویدا خۆی بەکیش دەکات لەنێوان ملیۆنان میرووی تردا .
هەر کاتێــک چاوەکــانی پۆلیســەکە و وتەکــانی پزیشــکی بەنــدیخانەکەم ئەهــاتەوە یــاد کە چــۆن ئەم ئــافرەتە هەمــوو شــتێک ڕەتــدەکاتەوە و لە زۆر شــت نــیگەرانە بەتــایبەت چــاوپێکەوتنی لەگەڵ مــن ، زیــاتر هەســتم بە ونبــوونی خــۆم دەکرد . لە یەکێک لە شەوەکاندا بیزاری و پەژارەیەك دایگرتم و پرسیاریك لەناخمەوە خۆی ئەسەپاند کە بریتی بوو لەوەی : ئەبیت لە چ جۆرە ئافرەتانیك بیت ؟!
وە ئایا کاتێک چاوپێکەوتنم ڕەتدەکاتەوە مانای ئەوەیە کە لە من باشترە ؟ بەڵام ئەو وتویژی لەگەڵ سەرۆکی دەوڵەتیشدا

رەتکردۆتەوە سەبارەت بە رزگار کردنی ژیانی لە خنکاندن . ئایا ئەو لە سەرۆکی دەوڵەت باشترە ؟
هەستێکی لە نێوان ئەفسانە و ڕاستی لام دروستبوو کە ئەم ئافرەتە لە هەموو ئەو پیاو و ئافرەتانە باشترە کە ئەیانناسین و ئەیانبینین و گوێمان لێیانە .
پاشان پرسیاریك لام دروستبوو بریتی بوو لەوەی : ئایا ئەم ئافرتە ئەمناسیت رەتیکردمەوە ، یاخود رەتیکردمەوە بێئەوەی بمناسیت ؟
بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر پاش ئەوەی چووم بۆ بەندیخانە چیتر هەوڵم نەدەدا چاوم بە فردۆس بکەوێت ، چونکە تەواو بیزار بوبووم لە دیداری ، بەڵام بەدوای ئافرەتە پۆلیسەکە یا پزیشکەکەدا ئەگەڕام . پزیشکەکە هێشتا نەهاتبوو ، پۆلیسەکەم دۆزیەوە لێم پرسی : فردۆس پێی وتوی کە ئەمناسیت ؟
لە وەڵامدا وتی : نەخیر . هیچی پێنەوتووم . بەڵام دەتناسێت .
لێم پرسی : چۆن زانیت دەمناسێت ؟
وتی : من هەستی پێدەکەم .
بە وەستاوی وەك پەیکەر لە جێگەی خۆم مامەوە ، پۆلیسەکە جێی هیشتم . ویستم هەنگاو بنیم بەرەو ئوتومبیلەکەم و بەندیخانە جێبهێڵم بەڵام لەجێگەی خۆم جولەم بۆ نەکرا . هەستکردنیکی قورس تەواو دڵم قورس دەکات و جەستەشی قورس کردووم ، قاچەکانم قورسن و توانای جوڵەیان نیە . هەستێکی قورستر لەزەوی وەك ئەوەی زەوی لەسەر من ڕاوەستابیت ، نەك من لەسەر ئەو

ڕاوەستابم ، بەڵکو ئاسمانیش وەك زەوی رەش بوو ئەویش پەستانی خستۆتە سەرم ، هەستێک کە لە ژیانمدا دووەمجارە روبەروی ببمەوە ، هەستی یەکەمینجارم ئەوەبوو پیاوێکم خۆشویست بەڵام ئەو منی خۆشنەویست ، رەتکردنەوەی بەلامەوە بریتی نەبوو لە رەتکردنەوەی مرۆڤیك لە نیو ئەم جیهانە گەورەیەی بە ملیۆنان مرۆڤی تیدایە ، بەڵکو رەتکردنەوەی هەموو جیهان بوو بۆ من بەهەموو شتەکانیەوە و بە هەموو ئەوانەی تیایدان .
سنگم بەرز کردەوە و خۆم ڕاستکردەوە تا هەناسەیەك هەڵمژم کەمێک قورسی سەر سەرم سووك بوو ، بەملاولای خۆمدا روانیم سەیر بوو بەم بەیانی زووە بە تەنهام لەم بەندیخانەیەدا پۆلیسەکەم بینی لە یەکێک لە ریرەوەکانی بەرامبەرمدا خەریکی سرینەوە و پاککردنەوەی زەویەکە بوو ، پاشان هەستێکی سەیر دایگرتم کە ئەم پۆلیسە ئافرەتێکە زەوی ناو بەندیخانەکە خاوین دەکاتەوە ناخوینیتەوە و نانوسیت هیچ شتێکیش سەبارەت بە زانستی دەروناسی نازانیت ئیتر چۆن ئەو هەستکردنەیم وا کتوپر بروا پێکرد ؟
فردۆس پێی نەوتووە کە ئەمناسیت ، بەڵکو ئەم وا هەست دەکات ، ئایا ئەمە واتای ئەوەیە کە بەڕاستی فردۆس ئەمناسیت ؟ گەر بیت و نەمناسیت و رەتم بکاتەوە ئەوا پێویستە ئەم رەتکردنەوەیە ئازارم نەدات ، چونکە ئەو بە تەنها هەر منی رەت نەکردۆتەوە ، بەڵکو هەموو جیهانی رەتکردۆتەوە بە هەموو ئەوانەی تیایدان .

بەرە و ئوتـومبیلەکەم کەوتـمە جـووڵە تـا بەنـدیخانە جێبهـێڵم ئەشـزانم کە پێویسـت نـیە ئەمجـۆرە هەسـتانە لێکـۆڵەریکی زانستی داگرێت لە کاتی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکدا.
خەریکبوو خەندەیەك دایدەگرتم لەو کاتەی خەریکبـوو دەرگـای ئوتـــومبیلەکەم ئەکـــردەوە ، بەرکەوتنـــی دەســـتم بە ئوتـومبیلەکەم کەمێـک متمـانەی بەخـۆم وەك پزیشـکیك بـۆ گیــرامەوە هەرچۆنیــك بیــت لە ئافرەتێــک باشــترە ســزای لەســـێدارەدانی بەســـەردا دراوە بە تـــاوانی کوشـــتن . هەسـتکردنی تەواوم بەخـۆم بـۆ گەڕایەوە ، کاتێـک بـزوینەری ئوتـومبیلەکەم بەگەڕ خسـت و پـێم لەسـەر بەنـزین دانـا بە هەموو هێزم ، هاوکـات پـێم نـا بەو هەسـتکردنە کتـوپڕەی کە زۆرجـار لەکـاتی شکسـت هێنانـدا بـۆم دیـت و وام لێـدەکات هەسـت بـکەم میروولەیەکـی بچـووك بـم بەسـەر زەویـدا بخشـیم لە نێـوان ملیۆنـان میـرووی تـردا . دواتـر لە دوای خـۆمەوە دەنگـێکم گـوێ لـێ بـوو کە لە دەنگـی بـزوینەری ئوتومبیلەکەم بەرزتر بوو هاواری دەکرد : دکتۆرە ! دکتۆرە !
پۆلیسە ئافرەتەکە بوو بە دوامدا بە هەناسە برکی رایـدەکرد و بە دەنگێکـی وەك ئەو دەنگـانەی لە خەونەکانمـدا دەمبیسـت بە دەمیکـی زل و دوو لێـوی گەورە لەبەرچاومـدا وەك دەرگـا ئەکـرایەوە و دادەخـرایەوە گـوێم لـێ بـوو ئەیـووت : فـردۆس دکتۆرە ! فردۆس بریاریداوە چاوی پیـت بکەوێـت ! ئەو پۆلیسـە گەر بیوتـایە سـەرۆکی دەوڵەت چـاوی پیـت ئەکەویـت هێنـدە ئەرکی نەدەکێشا و دەم و چاوی وا سور هەڵنەدەگەڕا.
منـیش وەك ئەوەی لەوەوە توشـی بـووبم هەناسـەم سـوار بوبوو . بە واتایەکی تر لێـدانەکانی دڵـم خێراتـر بـوو . نەمزانـی

چـــۆن لە ئوتــومبیلەکە دابەزیــم ، چـــۆن لەگەڵ پۆلیســـەکەدا ئەڕۆیشـــــتم و هەنگاوەکــــانم پێشــــی ئەکەوت , بەخێرایــــی جــوولەی قاچەکــانم زۆر ئاســـان بوبــوون بەنــاو ڕیرەوەکــانی بەنــدیخانەکەدا هەســـتم بە خۆشـــی و شـــادییەکی ســـەیر ئەکــرد ، ڕەنگــی ئاســـمانیش لە پێشـــچاومدا بــووە شـــین ، هەســـتم ئەکــرد بە چاوەکــانم ئاســـمانم گرتــووە و جیهــانم بەدەستەوەیە بەڵکو هەموو جیهـان مـوڵکی مـنە ، هەسـتێک بــوو لە ژیانمــدا جــارێکیتر هەســتێکی لەو جــۆرەم لا دروســت بوبــوو ، ئەویــش یەکەمــین چـــوونە دەرەوەم بـــوو لەگەڵ ئەو کەسەی بۆ یەکەمینجار خۆشمویســت . لە پاشــان لە بەردەم دەرگــای ژوورەکەی فردۆســدا کەمێــک وەســتام پــێش چــوونە ژوورەوەم تــاکو هەناســـەکانم ئــارام ببــنەوە و جلــوبەرگەکەی بەریشـم ڕیك بکەمەوە و خـۆم دڵنیـا بـکەمەوە کە لێکـۆڵەریکی زانســتیم یــاخود پزیشــکیکی دەروونــی هەر شــتێک بیــت لەو بـــابەتە تەقەی کلیلـــی کـــردنەوەی دەرگـــای ژوورەکە زیـــاتر متمانەی پتەو کردم و دوای ئەوەی بە تونـدی چـنگم لە جانتـا چەرمەکەی شانم گیر کردبوو لە دڵی خۆمدا ئەمووت : ئەبـی ئەم فـردۆس نـاوە کـێ بێـت ؟ ! لەوانەیە ... قســەکەم تەواو نەکرد ڕوبەڕوو خۆم بینیەوە لەگەڵیـدا . ســەرنجیکی زەوی نــاو ژوورەکەمدا . نەجوڵام . هیچ قسەیەکیشــم نەکـرد . گـوێم لە لێدانی دڵیشـم نەما . هەروەك گوێم لە دەنگی کلیلەکە نەبـوو کە لە دوامەوە دەرگــــــاکەی داخســـــــتەوە . وەك ئەوەی لەو ساتەی چـاوم بە چـاوی کەوت ژیـان لە جەسـتەمدا نەمابیـت دووچاوی بکوژانە ، وەك چەقۆیەکی تیژ بەبێ پێڵو و جووڵە .

ئەوکـات بە ئاگـا هـاتمەوە کاتێـک گوێبیسـتی دەنگێـک بـووم هەسـتمکرد دەنگـی ئەو بـوو . دەنگیشـی وەك چەقـۆ وابـوو جێگیر و قوڵ و سارد هـیچ لەرینەوەیەکـی تیـادا نەبـوو ، گـوێم لێبوو وتی : پەنجەرەکە دابخە .
منـیش وەك کـۆیلەیەکی ئەڵـقە لە گـوێ کـویرانە بەرەو پەنـجەرەکە رۆیشـتم و دامخسـت . بە سـەر سـورمانیکەوە بەملاولامـدا رووانـی . لە ژوورەکەدا نە جیگـای نوسـتن نە کورسیەك هیچ شتێکی تیادا نەبوو لەسەری دانیشم .
فردۆس وتی : لەسـەر زەویەکە دانیشە .
بێـئەوەی ئاگـام لێبیـت جەسـتەم لەسـەر زەویەکە دانیشـت . ئیمە ئەوکات لە یەکێک لە مانگە ساردەکانی زسـتاندا بـووین زەوی نـاو ژوورەکەش رووت بـوو کەچـی هەسـتم بە سـاردی نەکرد .
وەك کەسـێک بـووم کە بەدەم خەوەوە بـروات ، زەویـش لە ژێرمـدا شـێوەی زەویە و سـاردیەکی هەیە بەڵام ئەو سـاردیە بە جەسـتەم ناگـات ، وەك سـاردی دەریـا لە خەونـدا مەلەی تیادا ئەکەم بێـئەوەی هەسـت بە سـاردی بـکەم یـاخود نـوقم بـبم ، لەگەڵ ئەوەی جەسـتەم رووتە و مەلەش نـازانم .
دەنگیشـی وەك ئەو دەنگانە وابوو کە لە خەونـدا دەیانبیسـتین ، وا هەسـت دەکەیـن لە دوورەوە دیـت لە کاتێکـدا نـزیکە ، یاخود لە نزیکەوە دیت کەچی دوورە ، دڵنیا نین لە کویوە دیـت : لە سـەرەوە یـان لە ژێـرەوە ، لە ڕاسـتەوە یـا لە چەپەوە ، لەوانەیە وا هەسـت بکەیـن لە نـاخی زەویەوە دیـت یـاخود لە دڵی ئاسمانەوە ، یا وەك هەوایەك لە هەموو لایەکەوە دیـت و گوێمـان پـر دەکـات ، بەڵام ئەمە هەوا نـیە دەنگێکـی

ڕاستەقینەیە ئەیبیستم ، ئافرەتێکی ڕاستەقینەیە لە گۆشت و خوین لەسەر زەوی لە بەردەممدا دانیشتووە ، پەنجەرەی ژورەکەش داخراوە ، دەرگاش داخراوە ، ئەم دەنگە لە دەنگی ئەو زیاتر هیچ دەنگێکی تر نیە .
لێمگەڕی با قسە بکەم و پێم مەبرە ، لەبەرئەوەی کاتم نیە گویت لێگرم. لە کاتژمێر شەشی تەواوی ئیوارە دین و دەمبەن ، بۆ بەرەبەیان لێرە نابم ، هەروەك لە جێگەیەك نابم کەس بیزانیت . ئەم گەشتە بۆ جێیەکی نادیارە ، جیگایەك هەموو خەڵکی سەر ئەم زەمینە بە فەرمانرەوا و پادشا و کار بەدەستان و پیاوانی پۆلیسیش لێی بی ئاگان ، من شادمانم هەمیشە بەدوای شتێکدا دەگەڕام کە ئاسودە و دڵشادم بکات ، شتێک وام لێبکات هەست بکەم لە خەڵکی باشترم بە تایبەت فەرمانرەوا و کار بەدەستان . جار نەبووە ڕۆژنامە نەگرم بە دەستمەوە و وینەی هەر پیاوێکی تیادا نەبوبیت و من تفیکی لێ نەکەم ئەشمزانی تەنها تف ئەکەمە سەر کاغەزی ڕۆژنامەیەك کە لەژێر قاپ و قاچاغی ناو کەوانتەر و سەر میزەکاندا رامدەخستن ، پاشان لێدەگەڕام تفەکە خۆی وشك ببوایەتەوە .
هەرکەس منی ببینییایە ئەو تفەم دەکرد وایدەزانی ئەو پیاوە دەناسم بەڵام من هیچکام لەو پیاوانەم نەدەناسی چونکە من ئافرەتێکم و تەنها ئافرەتێک ناتوانێت سەرجەم ئەو پیاوانە بناسیت کە ڕۆژنامەکان وینەکانیان بڵاو ئەکاتەوە . هەر چۆنیك بیت من تەنها بەدخویەکی سەرکەوتوو بووم ، بەڵام هەرچەند ئافرەت بەدخوو بیت ناتوانیت هەموو پیاوان بناسیت ئەوەندە نەبێت کە ویستوومە هەر پیاوێکم ناسیبیت زللەیەك

بـــدەم بە دەم و چاویـــدا بەڵام لەبەرئەوەی ئـــافرەت بـــووم نەمـدەویرا ئەو کـارە ئەنجـام بـدەم ، وە لەبەرئەوەی بەدخـوو بـووم ئەو ترســەم بە چینیـك لە داودەرمـانی خـۆ رازانـدنەوە دەشـــاردەوە ، چـــونکە بەدخـــوویەکی ســـەرکەوتوو بـــووم سەرجەم دەرمانەکانم لە جۆرە باش و گرانبەهاکان بـوون وەك دەرمانی ئافرەتە بەد رەوشتەکان لە چیـنە باڵاکانـدا ، قژیشـم لای یەکێــک لە هەرە باشـــترین ئارایشـــتگاکانی تــایبەت بە خیزانە ئاست بەرزەکان چاك دەکرد ، هەروەك لێو سـورکردن و چاوەکـانم وەك چـاوی هاوســەری فەرمـانبەر بریتـی بـوو لە بانگهێشتکردن و رەتکردنەوە لە ئاستە باڵاکاندا ، بەڵام مـن لە ئاســـتە باڵاکـــان نەبـــووم تەنهـــا بە دەرمـــانکردن و قـــژم و پێڵاوەکانمـــدا نەبێـــت . ســـەر بە چینـــی ناوەنـــدیم بەپێـــی بەڵگەنامە دواناوەنـدیەکەی قوتابخـانە و حەزە خەفەکراوەکـانم و ســـەر بە چینەکـــانی خـــوارەوەم بەپێـــی لەدایکبـــوونم لە بـاوکیکی هەژاری جوتیـاری نەخوێنـدەوار لە ژیانـدا جـگە لە چانـدن و کێڵانـی زەوی هیچـی تـر نازانیـت لەسـەر و هەمـوو ئەمانەشەوە دانەوێڵە و بەرهەمی دراوسیکەی دەدزیت پێش ئەوەی دراوســیکەی بیـدزیت و کـچەکەی پـێش پێگەیشــتن ئەفرۆشـێت و هەمـوو شـەویك لە ژنەکەی ئەدات و هەمـوو بەیـانیەکی هەینـیش دشداشـەیەکی خـاوینی لەبەردەکـرد و دەچوو بۆ نویژ کـردن لە مـزگەوت لە پـاش نـویژ کـردن بـاوکم و چەنـــد کەســـێکی تـــری وەك خـــۆی بەدەم گەڕانەوەوە لە مزگەوت باسیان لە وتاری هەینی دەکرد ، باسـیان لە دانـایی و زمان پاراوی وتار خوین دەکرد لە وتەکانیدا هاتبوون کە دزیـن و فرۆشـــتنی گیانـــداری نەخـــۆش و لێـــدان و بیـــویژدانی و

دەستدرێژی بۆسەر ناموسی خەڵکی هەموو بە حەرامکردن ناو برابوون گوێڕایەڵی و ئەڵقە لەگوێیی و خۆشویستنی نیشتمان پێویستن و خوای گەورەش پادشا یا سەرۆکی وڵات بپاریزیت. ئەمبینین چۆن لەپەنا دیوارەکاندا سەرقاڵی دوعاکردن و تەزبیحات بوون باسی مامە شێخی وتار خوین دەکەن و زوو زووش سەریان بادەدا . دەمبینین بە دەنگی بەرز و گر قسەیان دەکرد و چاویان بز و ناو بە ناویش ژێر ورگ و ناولنگیان هەڵدەکڕاند و بە چاویکی پر قیزەونی و رق و دوژمنکارانە بەملاولای خۆیاندا دەیانروانی . زۆرجار باوکمم لە نێوانیاندا نەدەناسیەوە ، لە پاشان نەمدەزانی کامە باوکمە و لە دایکم ئەپرسی چۆن بەبێ ئەو منی بووە ، بەڵام لێی دام و لەگەڵ خۆی ئافرەتێکی هێنا مقەستێک یان گوێزانیکی پێبوو بە هەردووکیان پارچەیەك گۆشتیان لە ناو لنگم کردەوە.
بە درێژایی ئەو شەوە گریام بۆ بەیانی دایکم وەك ڕۆژانی تر نەیناردم بۆ کێڵگە . سەبەتەیەکی گەورەی ئەخستە سەرسەرم و رەوانەی کێڵگەی ئەکردم من کێڵگەم لە ماڵەوە پێخۆشتر بوو ، چونکە لەوی لەگەڵ بزن یاریم دەکرد و سواری پشتی دەبووم و لە گۆماویکی لیتەی نزیك کێڵگەکە لەگەڵ منداڵانی دیکە مەلە و شەرە ئاوم دەکرد . کوڕیکی منداڵی لە تەمەنی ئەوکاتەی خۆمدا هەبوو ناوی ( محمدین ) بوو لە ژێر ئاوەکەدا چرنوکی لێ دەگرتم و بەدوامەوە بوو لە پاشان لەناو پوش و زەلی ئەو ناوە پاڵی ئەخستم و کراسەکەی بەرمی هەڵدەدایەوە و یاری بووك و زاوامان دەکرد ، هەستم بە چێژیك دەکرد نەمدەزانی لە کویوەیە تاکو دۆزیمەوە کە پێشتر پێی ئاشنا بوبووم یاریمان دەکرد تا ڕۆژ ئاوا دەبوو لە

ناکاو دەنگی باوکیم ئەبیست لە کێڵگەی بەرامبەرمانەوە بانگی کورەکەی دەکرد ، منیش دەمگرت بەڵام ئەو رایدەکردوو دەیوت: سبەی دیمەوە .
هەر لەگەڵ خۆر ئەکەوت دایکم بە ئاگای دەهێنامەوە و دەیناردم بۆ ئاو , پاش ئەوەی کە ئاوم دەهێنا ئەنجا دەستم دەکرد بە گەسکدان و پاککردنەوەی گەوری ئاژەڵەکان و خواردن پێدانیان ، لە پاشان نانکردن و هەویر شێلان , دادەنیشتم و تەشتی هەویرەکەش لەناو لینگمدا و تینی گری تەنوریش قژی هەڵدەکروزاندم و لە کاتی سەرقاڵی و هەویر شێلاندا نەمدەزانی کە کراسەکەم هەڵدراوەتەوە تاکو ئەوکاتەی دەستی مامم بەر قاچەکانم دەکەوت کە هیواش هیواش دەستی دەهێنا لە ژێر ئەو کتێبەی وانەکانی تیادا دەخوێندەوە و گەر تەقەیەکیش بهاتایە خێرا دەستی دەکێشایەوە گەر کەسیش نەهاتایە زیاتر دەستی درێژ و گیر دەکرد ، نەمدەزانی لەو دیو کتێبەکەوە نوستبوو وا پرخەی دەهات یاخود بە ئاگایە و هەناسەی سوارە . ( محمدین ) چی ئەکرد ئەویش وایدەکرد و زیاتریش ، بەڵام من هیچ هەستێکم بە خۆشی و چێژ نەدەکرد وەك ئەوەی لە جەستەمدا ون بووبیت .
مامم منداڵ نەبوو . چەندین ساڵ لەمن گەورەتر بوو ، بە تەنیا ئەچوو بۆ ( میسر ) بۆ ئەزهەر بە مەبەستی خوێندن . منیش منداڵیك بووم هێشتا پێنەگەیشتبووم ، مامم قەڵەمی ئەخستە نێوان پەنجەکانم و وای لێدەکردم بنوسم : ا . ب . ج . د ... یان زۆرجار دەیوت : لە دوامەوە بڵیرەوە . ئەلف هیچی لەسەر نیە ، با خاڵێکی لە ژێردایە ، جیم خاڵێکی لە نێواندایە

، داڵ هیچـــی لەســـەر نـــیە . لە پاشـــان پـــاش ئەوەی نوســـینەکانی ( ئیـــبن مالـــك ) ی وەك قورئـــان دەخوێنـــدەوە سـەری لەگەڵدا دەجوڵانـد ، منـیش سـەرم دەجوڵانـد و چـی دەوت لە دوایەوە وەك خۆی دەموتەوە.
لە پـاش کۆتـایی هـاتنی پشـوش مـامم سـواری گوێـدرێژیك دەبـوو و منـیش لە دوایەوە ســەبەتەیەکی گەورەم لەســەر ســەربوو پـر بـوو لە هـیلکە و پەنیـر و نـان و لە ســەرویانەوە جلوبەرگەکەی تیادا بوو بە دوایـدا دەرۆیشـتم تـاکو ویسـتگەی شـەمەندەفەر لە ( دەلتا ) بە درێژایی ریگەکەش مامم باسـی ژوورەکەی خـۆیی بـۆ دەکـردم لە قەڵا لە کۆتـایی شـەقامی ( محمـد علـی ) ، ( ئەزهەر و عەتەبەت ئەلـخەزرا و تـرام ) و خەڵکـــی میســـر و بە دەنگێکـــی خۆشـــیش بە ســـواری گوێدرێژەکەوە گۆرانی دەوت و سـەری بـادەدا . پاشـان کاتێـک مـامم ســواری شــەمەندەفەرەکە دەبیــت و خــودا حــافیزەم لێدەکات دەگریم و پێی دەڵێم : لەگەڵ خۆت بمبە بۆ میسـر . مامیشـم دەیوت : لە میسـر چـی دەکەیـت فـردۆس ؟ منـیش دەموت : دەچـمە ئەزهەر و وەك تـۆ فیـر دەبـم . ئەنجـا مـامم پێـدەکەنی و دەیـوت : ئەزهەر تەنهـا بـۆ پیـاوانە . دەگریـام و دەســتم بە دەســتی مــاممەوە بــوو تــاکو شــەمەندەفەرەکە دەکەوتە جـــوولە و مـــامم دەســـتی رادەتەکانـــد و بە دەمـــدا دەکەوتمە سـەر زەوی .
پاشـــان دەگەڕامەوە بەرە و دوا بـــۆ مـــاڵەوە بە دڵشـــکاوی و ســـەرنجدانی پەنجەکـانم لەســـەر زەویە کشـــتوکاڵیەکان ، لە پاشـان لە دڵی خۆمدا دەمپرسـی من کیم ؟ ، بـاوکم کیـیە ؟ ، دایکـم کیـیە ؟ ئایـا تـاکو لە ژیـان دەردەچـم گەوری ئـاژەڵ پـاك

دەکەمەوە و سـەبەتە ئەخەمە سەرسـەرم و ڕۆژانـی
نانکردنیش هەویریکی زۆر دەشیلم ؟!
ئەنجا ئەهاتمە خانووە گڵینەکەی باوکم و سەرنجی دیوارە گڵینەکانم دەدا وەك ئەوەی بۆ یەکەمینجار بیت چوبیتمە ئەو خانووەوە و بەملاولای خۆمدا دەمروانی بەسەر سورمانەوە وەك ئەوەی خەڵکی ئیرە نەبم و لە ئاسمانەوە کەوتبمە خـوارەوە یـاخود لە نـاخی زەویەوە هـاتبیتمە دەرەوە و لە جیگایەکم جێی من نیە و لە ماڵیکدام ماڵی من نەبێت و باوك و دایکم هی خۆم نین .
ئەبیت قسەکانی مامم لە بارەی میسرەوە وای لێکردبم ؟ یاخود من ئەو کەسە نیم کە دایکم بوویەتی ! یاخود کاتێک لەدایك بووم گۆرام یان دایکم گۆراوە و بووە بە ئافرەتێکی تر ؟ دایکم نیە بەڵام لەو ئەکات ؟
هەوڵم دەدا شێوەی ڕاستەقینەی دایکمم بیتەوە یاد وەك بۆ یەکەمینجاری بینیم لە ژیانمدا . دووچاو بە ئاستەم لەیادم ماوە . نازانم رەنگیان چۆن بوو ؟ شێوەیان چۆن بوو ؟ . دووچاو هەموو کات چاودیرییان دەکردم و لێم ون نەدەبوو ، دوو چاو گەر لە کاتی پێگرتنمدا بکەوتمایە دەیانگرتم و نەیدەهێشت . دووچاوی خری رەش نازانم گەورە بوون یاخود بچووك بیرم نیە هێندە نەبێت کە دەزانم چاوی دایکم بوو . چۆن زانیم دایکمە نازانم . لە پاشان خۆم خشاند بەرە و سنگی تاکو گەرمم بکاتەوە . خانووەکەمان سارد بوو باوکم جێگەکەی ئەبردمە نزیك تەنورەکە . دایکم لە زستاناندا گەرمی نەدەکردمەوە . بەڵکو باوکمی گەرم دەکردەوە ، هاوینانیش دایکمم دەبینی بە تەشتێکەوە بە ئاوی سارد قاچی باوکم دەشوات .

پـــاش ئەوەی دەســـــتەکانم کەمێـــک گەورە بـــوون بـــاوکم تەشـــتەکەی دایە دەســـتم و فیـری کـردم چـۆن قاچەکـانی بشۆم . وام لێهات لە جیاتی دایکم کـارم ئەکـرد . دایکـم چـوو بـــۆ کـــوی نـــازانم ، بەڵام بینـــیم کە ئـــافرەتێکی تـــر دای بە دەستمدا و تەشتەکەی لـێ وەرگـرتم . بـاوکم پێـی وتـم : کە ئەوە دایکـــمە . شـــێوەی دەم و چـــاو و کراســـەکەیی و جوڵانـدنەوەکانی لە دایکمـی دەکـرد . لە پاشـان زانـیم کە دایکمە پاش ئەوەی سـەرنجی دەم و چاویمـدا . بەڵام ئەو دوو چـاوە نەبـوون کە لە منداڵیمـدا دەمبینـین ، هەمیشـە چـاوی داخراو بوو هەرگیز خۆر لێی نەدەدا ، شـەوانە بە دەنگێکی نزم ئەگریام تاکو خوشك و براکـانم لامەوە نوسـتبوون گوێیـان لـێم نەبێـت و بە ئاگـا نەیەن منـیش وەکـو خەڵکـی خوشـك و برایەکـی زۆرم هەبـوون کە بەهـاران زیادیـان دەکـرد وەك جوجەڵە ، زسـتانانیش هەڵـدەلەرزین و پەر و باڵیـان دەوەری و لە هاویندا تووشـی سـکچوون و نەخۆشـی دەبـوون و دەمـردن یەك لە دوای یەك . گەر کچێـک بمـردایە ئەوا پـاش ئەوەی باوکم نانی دەخواردوو دایکم قاچەکانی بۆ دەشۆرد ئەنووست و هـیچ نەدەقەومـا ، بەڵام گەر کوڕیـك بمـردایە بـاوکم لە دایکمی دەدا ئەنجا دەنووست .

هەرگیز باوکم بی نـانی شـیوان نەدەنوسـت . زۆرجـاریش کە مـاڵەوە خـواردنی تیـادا نەبـوو هەمـوو بـی شـیو سـەرمان دەنـایەوە و دەنووسـتین ئەو نەبێـت . دایکـم خـواردنەکەی لە جیگـایەکی نادیـاردا لە تەنـورەکەدا لە ئـیمە دەشـاردەوە بـۆ بـاوکم ، ئەویـش بە تەنیـا دادەنیشـت و دەسـتی دەکـرد بە نانخواردن و ئیمەش سـەیرمان دەکرد . جارێکیان دەسـتم درێـژ

کــرد بــۆ قــاپەکەی بەردەمــی بەڵام دای بە دەســـتمدا . لە برســـان نەگریـام . لە بەردەمیـدا دانیشــتم ســـەرنجم دەدا ، چاوەکـــانم ســـــەرنجی دەســــتەکانی دەدا هەر لەو کـــاتەی دایـدەگرتن بـۆ ئەو قـاپەی بەردەمـی تـا ئەو کـاتەی ئەیبـرد بـۆ دەمــــی . دەمــــی گەورە بـــوو وەك دەمــــی وشــــترمل و دوو شـەویلگەی فراوان ، ئەوی سـەرەوە ئەهـاتە خـوارەوە و دەیـدا بە شـەویلگەی خوارەوە و خـواردنەکەی دەجنـی و ددانەکـانی بەیەکیانــدا دەداو زمــانی لە نــاوەوە ئەخــولایەوە وەك ئەوەی زمانیشـی بخـوات زۆرجـاریش زمـانیکی دەهێنـایە دەرەوە تـاکو گەر خواردن جیمابیـت بەمـلاولای دەمـیەوە بیبـاتە نـاوەوە ، لە پاشــان دایکـم شــەربەی ئـاوەکەی دەدایە دەســت بـاوکم و و ئەیخـــواردەوە و ورگـــــی تێـــر دەکـــــرد و بە دەنگێکـــــی بەرز قرقینەیەکـی گەورەی دەدایەوە لە پاشــان دەســتی دەکـرد بە جگەرە کێشان و دەور و بەری خۆی دەکرد بە دووکەڵ و قـرخە قرخـــی بـــوو ، ئەنجــا جـــگەرەکەی وەلاوە دەنـــا و ئەنوســــت هێندەی نەدەبرد دەستی دەکرد بە پـرخە پـرخ و پـرخەی ڕۆژە رییەك دەرۆیشـت . زانیم کە ئەوە بـاوکم نـیە ، بێـئەوەی کەس پــێم بڵیـــت ئەم نهێنیەشـــم بە هـــیچ کەس نەوتبـــوو . ئەم نهێنــیەم بە شـــاراوەیی لای خـــۆم هەڵگرتبـــوو . لە پشـــووی هاوینیشـدا مامم دەهاتە لامان و منـیش تونـد دشـداشــەکەیم دەگـرت و پـێم دەوت : تکـات لێـدەکەم لەگەڵ خـۆت بمـبە بـۆ میسـر مامم لە باوکم بـۆم نزیکتـر بـوو ، چـونکە وەك بـاوکم بە تەمەن نیەو دەیهیشـت لایەوە دانیشــم و ســەیری کتێبەکـانی بـکەم . فیـری پیـتە بزوینەرەکـانی کردبـووم . لە پـاش مردنـی

باوکیشـــم نــاردمیە قوتابخــانەی تەوزیمــی و پــاش مردنــی دایکیشم لەگەڵ خۆی بردمی بۆ میسر .
ئایا مرۆڤ  دەتوانیت دوجار لە دایك ببیت ؟ کاتێـک کە دەسـتم نا بە پلاکی کارەبادا و روناکی سـەرجەم ژورەکەی پـر کـرد پـر بە دەنگ هاوارم کردوو چاوم نوقاند پاشـان چـاوم کـردەوە وەك ئەوەی ســەر لە نــوی بــۆ جــاریکی تــر لە دایــك بــبمەوە . بۆیەکەمینجار بـوو خـۆم لە ئـاوینەدا ببیـنم . سـەرەتا نەمزانـی ئـاوینەیە زۆر ترسـام کە بینـیم کچێکـی منـداڵ بە کراسـیکی کـورتەوە لەسـەر ئەژنـۆ و دوو قـاچی لە پـێڵاودا وەسـتاوە کە مـامم بـۆی کریبـووم بـۆ ئەوەی کە چـوومە قوتابخـانە لە پێـی بـکەم ، مـاوەیەکی دوور و درێـژ لە بەردەم ئـاوینەکەدا مـامەوە سەرنجی روخساری خۆمم دەدا و وورد دەبوومەوە . من کـیم ؟ وەك بانگم دەکەن فردۆس ، لوتم لە لـوتی بـاوکم دەچیـت و دەمیشـــم لە دەمــی دایکــم ، منــیش فردۆســـم و نــاگۆریم هەرچەند جلوبەرگی نوی و پێڵاوم لە پێ بیت .
قیـنم لە ئـاوینە هەڵگـرت و چیتـر لـێم نەدەروانـی ، گەر لێـی بـروانم تەنهـا بـۆ ریـك کردنـی جلـوبەرگم و قـژ داهێنـان بـوو ، پاشـــان جانتــاکەم هەڵـــدەگرت و دەچـــووم بـــۆ قوتابخـــانە ، قوتابخــانەم خۆشـدەویســت لەبەرئەوەی کــوڕان و کچــانیکی زۆری لێبـوو ، قسـەمان دەکـرد و هەڵـبەز و دابەز و پێکەنـین و گڵـۆپێ بنیشــتمان دەتەقانــد و تەمەرهینــدمان دەخــوارد ئەو سەردەمە هەموو شتێک چێژیکی تایبەتی خۆیی هەبوو .
پاشـــان دەگەڕامەوە مــاڵەوە و مــاڵم پــاك دەکــردەوە و ریکــم دەخست جلوبەرگی مامم دەشـۆری و ژورەکەیـم دەرازانـدەوە ، ئوتـویەکی بـۆ کریبـووم پـاش گەرمکردنـی لەسـەر ئـاگری

غازەکە جلوبەرگ و عەمـامەکەی لەگەڵ ( تەربـوش ) ە کەیـم ئوتو دەکرد و پاش خۆر ئـاوا بـوون بە کەمێـک مـامم لە ئەزهەر دەگەڕایەوە منیش خواردنم ئامـادە دەکـردوو بە یەکەوە نانمـان دەخـوارد و مـن دەچـوومە سـەر قەنەفەکە و ئەویـش دەچـووە سـەر جیگـاکەی و بە دەنگـی بەرز کتێبەکـانی دەخوێنـدەوە و منـیش دەچـوومە سـەرجیگاکەی و دەسـتکاری کتێبەکـانیم دەکـرد و سـەرنجی ئەو نوسـینە رەشـانەم دەدا کە لە پەرەکانیاندا نوسرا بوون و هەوڵم دەدا هەنـدێکیان بخـوینمەوە ( ئەزهەر ) جیگـایەکی بە بەهـایە جیهـانیکە بۆخـۆی ، تەنهـا پیاوان بۆیان هەیە بچنە ناوی مامم دەنگە بەرزەکەی لە کـاتی خوێندنەوەدا سـامناك و جـێگەی سـەرنج بـوو ، پەنـجە درێـژ و گەورەکانی ترسیکی تیدا بوو هەر کاتێک دەمگوشین شتێکی منداڵیم بەبیر دەهاتەوە نەمدەزانی چیە .
لە شـەوە سـاردەکانی وەرزی زستانیشـدا وەك سـاوا لە باوەشـی ماممدا خۆم گرمـۆڵە دەکـرد ، گەرمـی دەکـردمەوە و گەرمـی دەکـردمەوە سـەرم لە سـنگیدا نـوقم دەکـرد و ئەمویسـت پێـی بڵـێم خۆشـم دەویـی بەڵام نەم دەوت ، دەمویسـت بگـریم بەڵام نەدەگریـام دواجـار دەنوسـتم نوستنیکی قوڵ تا بەیانی .
ڕۆژیـك دوچـاری گەرم داهـاتن و ( تـا ) بـووم مـامم لە نـزیکم دانیشـت سـەری ئەشـیلام و دەسـت و پەنـجەی دەهێنـا بە دەم و چاومـدا ئەو شـەوە تـا بەیـانی دەسـتی مـامم تونـد گوشـیبوو و خەوم لـێکەوت . ئەو ڕۆژەی بروانـامەی تەواو کردنـی قۆنـاغی سـەرەتاییم لە قوتابخـانە پێـدرا مـامم کـاتژمێریکی بچکـۆلانەی بـۆ کـریم و شـەوەکەی لەگەڵ خـۆی

بردمــی بــۆ ( ســینەما ) یەکەمجــارم بــوو لە ژیانمــدا بچــمە ســینەما ، لەوی ئــافرەتێکم بینــی ســەمای دەکــرد ســمت و رانی دیار بوو ، پیاوێکیشم بینی دەستی کردە ملی ئافرەتێک و ماچیکرد منیش بە هەردوو دەستم دەم و چاوم شـاردەوە و نەم دەویرا لا بـکەمەوە بەلای مامـمدا . مـامم وتـی : مـاچی دەم حەرامە سـەماکردن حەرامە ، بەڵام مـن هەر نەم دەویـرا ســەیری دەم و چــاوی بــکەم ئەو شــەوەش کە گەڕامەوە لە ســینەما وەك جـاران لە نزیـك مـاممەوە دادەنیشــتم و لەژێــر بەتـانیەکەوە خـۆم حەشــاردا لەســەر قەنەفە بچکـۆلانەکەی جـاران لەســەری دادەنیشــتم . دەترســام و هەڵـدەلەرزیم بە خەیاڵمدا دەهات ئێستا نا ئێستا پەنجە درێژەکـانی مـامم لـێم نزیك دەبیتەوە ، پاش کەمێکـی تـر بەتـانیەکە بەرز دەکـاتەوە و لێوەکــانی بەر لێــو و دەم و چــاوم دەکەویــت و بەهێمنــی پەنجەکانی بەسـەر رانمدا بەرە و ژوور دینیت .
هەستێکی سەیر بوو پێشـتر وانەبـووم ، هەروەك هەسـتم بە چێژیکــی ونبــوو دەکــرد لە جێگەیەکــی جەســتەمدا ، یــاخود چێژیکی نوی ناتوانم جێگەکەی دیـاری بـکەم ، وەك ئەوەی لە جێگەیەکی دەرەوەی جەستەمدا بیت .
وایلێهـات چـوونە دەرەوەکـانی مـامم روو لە زیـاد بـوون بـوو . بەیانیــان بەئاگــا دەهــاتم دەمبینــی ئەو چوبــووە دەرەوە ، شــەوانیش پــێش هــاتنەوەی دەنوســتم ، کــاتێکیش کە پەرداخیــك ئــاو یــا قاپێــك خــواردنم دەدایە لێــی وەردەگــرتم بێـئەوەی سـەیرم بکـات . ئەو کاتـانەش کە دەنوسـتم سـەرم دەکرد بە ژێر بەتانیەکەدا و گوێم هەڵدەخست بـۆ تەپەی پێـی هەناســەکانم دەشــاردەوە و خــۆم دەکــرد بە نوســتوو ،

چاوەروانی پەنجەکانی بووم بهاتایە بەڵام نەدەهات ، گـوێم لە جیـرەی چرپـاکەی بـوو کە لەسـەری دەنوسـت و ئەمـدیو و ئەودیوی دەکرد ، دەمزانـی خەوی لێکەوتـووە کاتێـک گـوێم لە پرخە دووبارە و ناسراوەکەی دەبوو .
پاشـان مـامم بـوو بە پیـاوێکی تـر ، چیتـر وەك جـاران پـێش نوسـتن نەیدەخوێنـدەوە ، هەروەك ( تەربـوش ) و عەمـامەی نەدەبەست ، دەستێک جلوبەرگی نویی کـری و لە وەزارەتـی کار و باری ئیسلامی کرایە فەرمـانبەر و کچـی مامۆسـتاکەی ئەزهەری خواسـت و کـردیە هاوسـەری خـۆی . لە پاشـان مـامم داوای لێکـردم بچـمە قوتابخـانە و قۆنـاغی ناوەنـدی بخـوینم ، ئەنجـا بردمـی بـۆ مـاڵە نـویکەی تـاکو لەگەڵ هاوسـەرەکەی بـژیم . ژنەکەی ئـافرەتێکی سـپیێ پێسـتی کورتە باڵای قەڵەو بوو ، کاتێک بەریگادا دەرۆیشـت جەسـتەی لە قەڵەویدا ئەملاولای دەکرد ئەچووەوە سەر مـراوی دەنگێکـی ناسك و هێمنی هەبوو پر بوو لە رق و کینە ، چاوەکـانی رەش و گەورە و خەواڵوو و مات بوو .
قاچەکـانی مـاممی دەشـۆرد و مامیشـم لێـی نەدەدا و دەنگیشـی بەسـەردا بەرز نەدەکردەوە ، بە رەوشـت مـامەڵەی لەگەڵ دەکـرد بەڵام ئەو جـۆرە رەوشـتەی پیـاوان لە مـامەڵە کردنیان لە ئافرەتانی دەگرن . هەستم دەکـرد مـامم هێنـدەی لێی دەترسا خۆشـی نەدەویسـت ، چـونکە لە ئاسـتێکی بـاڵا بوو ، کاتێک گەر بـاوکی یـا یەکێـک لە ئەنـدامانی خیـزانەکەی سـەردانی بکردینـایە مـامم گۆشـت و مریشـکی دەکـری و تریقەی پێکەنینی دەنگی دەدایەوە ، بەڵام گەر پوری مـامم بە جلوبەرگە گوندیەکانیەوە بهاتایە ژنەکەی لە کونجیکی مـاڵەکە

بیــدەنگ و دوور دادەنیشـــت ، زۆرجــار لەگەڵ مــن لە ژورەکەم دەگریا و دەیوت : گەردن ملە ئاڵتونەکەم فرۆشت تا خوێنـدنی ئەزهەر تەواو بکــات ، بەیانیــانیش ســەبەتە پــر لە هــیلکە و کولێرە و کەرەی خاڵی دەکردەوە و دەرۆیشت ، من پێم دەوت : داپێرە یەك دوو ڕۆژی تر لامان بمینەرەوە بەڵام مامم خـوڵکی نەدەکــرد و ژنەکەشـــی بیــدەنگی لــێ دەکــرد . کاتێــک لە قوتابخانە دەگەڕامەوە گەسکم دەدا و مـاڵم خـاوین دەکـردەوە ئـامۆژنم تەنهـا خـواردنی دروســت دەکـرد و قـاپ و قاچـاغی پێسیشـــی بـــۆ مـــن جـــی دەهێشـــت ، پاشـــان مـــامم خزمەتکــاریکی منــداڵی هێنــا لە ژورەکەی مــن لەگەڵ منــدا دەنوســـت ، مـــن لەســـەر جــێگە و ئەو لەســـەر زەوی لە شــەوێکی ســاردی زســتاندا پـێم وت : وەرە لەســەر جـێگەکە لای منەوە بنوو ، بەڵام کاتێـک ئـامۆژنم هـات و بینـی لەسـەر جیگاکە لای منەوە نوستووە لە هەردووکمانیدا .
ڕۆژێکیــان لە قوتابخــانە گەڕامەوە بینــیم مــامم و ئـامۆژنم لـێم تــورەن تــا وایلێهــات مــامم جلــوبەرگ و کتێبەکــانمی پـــێ کــۆکردمەوە و بردمــی بــۆ قوتابخــانە و لەو ڕۆژەوە لە بەشـــی نــاوخۆیی دەمــامەوە و هەر لەویــش دەنوســتم ، لە کۆتــایی هەموو هەفتەیەکیشدا دایك و باوك و کەسـوکاری قوتابیەکـان دەهـاتن تـاکو قوتابیەکـان بەرنەوە پێنجشــەممان و هەینـی لە مـــاڵەوە بەســـەر بەرن ، منـــیش لەســـەر دیـــواری بەرزی قوتابخــانەوە ســـەیری دەرەوە و خەڵکــیم دەکــرد وەك چــۆن زینـــدانیەك لە زینداـنــدایە و پەرۆشـــی دەرەوەیە . ســـەرەرای هەموو ئەمانەش من قوتابخانەم هەر خۆشـدەویست ، کتێبـی نوی و زانستی نوی و هاوریکانم سەرجەم لە تەمەنی خۆمدا

بـوون بەیەکەوە ئەمانخوێنـد ، هەریەکەمـان بـۆ ئەویتـر باسـی ژیان و نهێنیەکـانی دەکـرد ، هـیچ کیشـەیەکمان نەبـوو تەنهـا بەرپرسـی ریکخستنی کـار و بـاری نـاو نـاوخۆییەکە نەبێـت کە ئافرەتێکی ڕەق و بی کەڵك بوو شـەو و ڕۆژ چاودیری دەکـردین و گــوێی بــۆ قســەکانمان شــل دەکــرد تەنــانەت ئاگــاداری خەونەکانیشـمان بـوو لە کـاتی نوسـتندا ، هەر کـاتێکیش گەر یەکێکمـان پەدەم خەوەوە چەنـد وشــەیەکی بدرکانــدایە وەك مۆتەکە هەڵی دەکوتایە سـەری .

هاورییەکم هەبـوو جـێگەکەی لە نزیـك جـێگەکەی مـنەوە بـوو ناوی ( وفیە ) بوو ، پاش ئەوەی روونـاکی نەدەمـا و گڵۆپەکــان دەکــوژانەوە ســەری دەهێنــایە نزیــك ســەرم و دەستمان دەکرد بە چپە چپ و قسـە کردن تـاکو نیـوەی شـەو ، ئەو باســی کــوڕی مــامەکەی بــۆ دەکــردم کە چەنــدی خۆشــدەوی و ئەمــیش چەنــد ئەوی خۆشــدەویت ، منــیش باسـی ئاوات و خەونەکانی داهاتومم بۆ دەکرد . هیچ شـتێکی بەرچاوم نەبوو لە سـەردەمی منداڵیم و رابردوومدا تابۆی بـاس بکەم ، لە ئێسـتاشـمدا نە خۆشـەویستی و هیچ شـتێکی تـری لەو جۆرەم لا نەبوو تەنها و تەنها داهاتووم لەبەردەستدا بوو تـا باســی لــێ بــکەم ، داهــاتوو مــوڵکی مــنە گۆرانکــاری و نەخشـەی تیادا دەکیشـم بە سـەربەستی و بە ئارەزووی خـۆم .

زۆرجـار بەبیرمـدا دەهـات لە داهـاتوودا بـبمە پزیشــك ، یـاخود ئەندازیار یا پاریزەر و دادوەر. ڕۆژێـك سـەرجەم قوتابخـانە چـووە دەرەوە خۆم لەسـەر شـانی کچەکـانی هـاوریم بینـی و هـاوار دەکەم لە دژی روخانــدنی حکــومەت ، کاتێــک گەڕامەوە بــۆ

قوتابخــانە دەنگــم دەرنەدەهــات و ســەر و قــژم ئاڵۆســکاو جلــوبەرگم دراو و هــیلاك و مانــدوو بەڵام ئەو شــەوەم بە داڵغەی سەرکردە و سەرۆك دەوڵەتەوە بەسەر برد .
ئەمزانــی کە ئافرەتــان نــابنە ســەرۆکی دەوڵەتــان ، بەڵام هەسـتم دەکـرد مـن وەك بـاقی ئافرەتـان و کچـانی تـر نـیم ، چونکە سـەرجەم کچان باس لە خۆشـەویسـتی پیـاوان دەکەن و مـن وانـیم و ئەوەی کچـانی سـەرقاڵ کردبـوو و بەلایـانەوە گرنگ بوو لای من بەتاڵ بوو .
شــەویك لە شــەوان ( وفــیە ) لێــی پرســیم : فــردۆس خۆشەویســتیت کـردووە ؟ پـێم وت : هەرگیـز وفـیە هەرگیـز خۆشەویستیم نەکردووە . بە سـەر سـورمانیکەوە سـەیریکی کردم و وتی : سەیرە ، لێم پرسـی : بـۆچی سـەیرە ؟ وتـی : دەم و چــاوت دەڵێــت خۆشەویســتت هەیە . وتــم : چــۆن ؟ سەریکی باداو وتی : نازانم ، بەڵام من وا هەست دەکەم کە تۆ ناتوانیت بی خۆشەویستی بژیت . پێم وت : بەڵام من بـێ خۆشەویسـتی ئەژیـم . وفـیەش وتـی : یـا درۆ دەکەیـت یـان ئەوەتا ناژیت . ئیتر وفیە نوسـت ، منـیش بە چـاوکراوەیی هەر سەرنجی تاریکیەکەم دەدا . چەند وینەیەکی نوقم بـووی دوور دەهاتن و دەچوون لە تاریکیەکەدا ( محمـدین ) م بینـی لەنـاو پـوش و پەڵاشــدا راکشــاوە ، بـۆنی گژوگیـا و پـوش و پەڵاش دەهــاتە بەر لــووتم ، هەســتی بەرکەوتنــی پەنجەکــانیم بە جەستەم دەهاتەوە یاد ، هەسـتم دەکـرد چێـژی کـۆن لام ون بــووە و جـێگەکەی نــادۆزمەوە ، هەســت دەکەم لە دەرەوەی جەســتەمە بەڵام لەســەر جەســتەمە ، تەزوویەك لــێم دەدا سـەرەتاکەی وەك ئازاریك وایە و کۆتاییەکەشـی چێژە ، شـتێکە

ئەمەویت بیگرم ، دەستی لێبدەم گەر بۆ ساتێکیش بوویێت ، بەڵام وەك هەوا لە دەستم دەردەچیت ، وەك سەراب ، یان خەونیك ، بڵاو دەبێتەوە و وون دەبێت ، ئەنجا دەست دەکەم بە گریان بەدەم خەوەوە وەك ئەوەی ئێستا لێم ون بوویێت و پێشتر لام بوونی هەبووە .
شەوانی قوتابخانە درێژ بوو ، ڕۆژەکانی درێژ تر ، بیرمە وانەم دەخوێند کاتێکیش کە ماوەیەکی زۆرم لەبەردەستدا دەبوو تاکو زەنگی نوستن لێدەدرا دەچوومە کتێبخانەی قوتابخانە کە ژوریکی تاریك و تۆزاوی تۆز سەر هەموو کتێبەکان نیشتبوو بە پارچەیەك قوماشی زەرد تۆز و پێسیەکەم پاك دەکردەوە دەستم دەکرد بە خوێندنەوە لە هەر کتێبێکی نویدا شتێکی نوی فیر دەبووم . فیرعەونەکانم ناسی فارس و تورك و عەرەبم ناسی . لە بارەی تاوانی پادشا و فەرمانرەواکان شتم خوێندەوە ، هەروەها لەبارەی جەنگ و شۆرشی میللەتان و ژیانی شۆرشگیران شتم خوێندەوە . بەڵام من حەزم دەکرد لەبارەی سەرۆك و فەرمانرەواکانەوە بخوینمەوە زیاتر وەك لە باس و خواسی خۆشەویستی . لەبارەی فەرمانرەوایەکەوە خوێندمەوە کە هێندەی سەربازەکانی ئافرەتی سۆزانی و بەردەستی هەبووە ، فەرمانرەوایەکی تر هەموو کار و فرمانی بریتی بووە لە خواردنەوەی مەیی و چوون بەلای ئافرەتانی بەد رەوشتەوە و لێدانی کۆیلەکان بە قامچی ، فەرمانرەوایەکی تر ئافرەتی ناویت بەڵکو حەز و خۆشی و کات بەسەر بردنی بریتی بووە لە ئاژاوە نانەوە و جەنگ هەڵگیرساندن و کوشتن و خوین رشتن ، فەرمانرەوایەکی تر حەزی بە کۆکردنەوەی سامان و زیرە ،

فەرمــانرەوایەکی تــر شــانازی بە گەورەیــی و دەســەڵاتی خۆیەوە دەکات و هیچ پیاوێکی جگە لەخـۆی بە پیـاو نازانیـت ، فەرمانرەوایەکی تـر حەزی بە تـاقیکردنەوە و نەخشـە دانـان و درۆ و دەلەسە کردنە لەگەڵ خەڵکی و مێژوودا .
لە پاشان بۆم دەرکەوت کە سەرجەم ئەوانە پیـاون و هەسـت و کەسـیتیان لاوازە و حەز و خۆشـییان بـۆ پـارە و سـێکس و دەسەڵات سنووری نیە و چـاودێری بەسـەرەوە نـیە و لەسـەر زەوی هەرچی خوا پێی ناخۆشـە دەیـکەن , دزی و درۆ لەگەڵ خەڵکـی دەکەن و هێنـدەش پـتەون دەنگیـان خەڵکـی قایـل دەکــات و قســەکانیان هەنگــوێنە ، تیرەکانیــان ژەهــراویە ، مێژووش رووی ڕاستەقینەیان ناخاتە روو تـاکو پـاش مردنیـان ، لە پاشــان میـژوو بەهەمـان رەنـگ و سـوور بـونیکی زیـاترەوە خۆی دووبارە و سیبارە دەکاتەوە .
ڕۆژنــامەو گۆڤارەکــان دەهــاتنە کتێبخــانە و دەمخوێنــدنەوە و سەیری وینەی فەرمـانرەوا و کـار بەدەسـتانم تیـادا دەکـرد کە چــۆن لە نــویژی هەینیــدا دانیشــتووە و چــاوە تێکشــکاوە بێدەسـەڵاتەکانی ئەتروکینـی فیـڵ لە خـوا دەکـات وەك چـۆن فیڵ لە خەڵکی دەکات ، لە دەور و بەری ئەم فەرمـانرەوایەش کار بەدەستان و بەرپرسانی خوار خۆی هەمـوو بێدەسـەڵاتانە دانیشـتوون و ( بسـملا ) دەکەن و بە چـاویکی دوژمنکـارانەی پـر گومـانەوە بەمـلاولای خۆیانـدا دەروانـن ، ئەیـان بیـنم نـوێژ دەکەن بۆ گیانی شەهیدانی نیشتیمان ، ئەوانەی مردوون لە جەنگیکـدا یـاخود برسـی بـوونیکی بەکـۆمەڵ یـان دەردیکـی کوشـندە ئەمبینـین سـەریان شـۆر دەکـردەوە و دواوەیـان بەرز دەکـردەوە هەمـووان گۆشـتن و ترسـنۆك ، هەرکە وشـەی (

نیشتیمان ) لە لێوەکانیان دەردەچوو دەستبەجی ئەمزانـی کە لە خوا ناترسـن ، نیشـتیمانیش بریتـی بـوو لە مردنـی رۆڵەی هەزاران لە پێناو زەوی ئەواندا .
لە دوای ئەوەی لە خوێنــدنەوە و میــژووی دووبــارە و ویــنە و چیرۆکــی دووبــارە بیــزار دەبــووم لە گۆشــەیەکی تــاریکی هۆڵەکەدا بە تەنیا دادەنیشتم لە داڵغەی ئەوەی لە داهـاتوودا دەبم بەچی ؟ ئایا ئەچمە زانکۆ ؟ ئایا مامم دەمخاتە زانکۆ ؟
جارێکیــان یەکێــک لە مامۆســتاکان بینیمــی دانیشــتبووم ، ســەرەتا مــن زۆر ترســام لەو پەیــکەرە رەشــە گەورەیەی لەو تـاریکیەدا لەبەردەممـدا قـوت بـوەوە . پـێش ئەوەی لـێم نزیـك بیــتەوە لە دوورەوە وتــی : ئەوە کیــیە لەویــدا دانیشــتووە ؟ منیش بە دەنگێکی هێمنانەی پـر ترسـەوە وتـم : مـنم ، مـنم فــردۆس . لە پاشــان نزیــك بــوەوە ســەری ســورما کە مــن باشــترین و زیرەکتــرین قوتابیــانی پــۆلەکەیم کە دەســتبەجی گوێبیستی زەنگی نوستن بونایە دەنوستن .
پێم وت : بیتاقەتم خەوم لێناکەویت ، لەگەڵم دانیشت نـاوی ( ئیقبال ) بوو جەستەی پر و کورت بوو ، قـژی درێـژ و دووچـاوی گەورەی رەش لە تـاریکیەکەدا دەمبینــی ، ســەیری دەکــردم دەمبینــی هەرچەنــد تــاریکبوو ، هەرچەنــد دەمویســت دوور بــکەومەوە بە دوامــدا دەهــات و دەیگــرتم ، نەمدەویســت سـەیری بـکەم بە دەسـتەکانم دەم و چـاوم دەشـاردەوە بەڵام ئەو هەر ســەیری دەکــردم پاشــان دەســتم کــرد بە گریــان ، دەستمی لەسـەر دەم و چاوم لادا و وتی : فـردۆس . فـردۆس . تکـات لێـدەکەم مەگـری . وتـم : لـێمگەڕی بـابگریم . وتـی : هەرگیز نەمبینیووە بگریت ، چی قەوماوە ؟ وتم : هیچ ، هـیچ

وتی : نابیت ، ئەبی شتێک رویدابیت . وتـم : هـیچ رویـنەداوە مامۆسـتا ئیقبـال . بەسـەر سـورمانەوە وتـی : بەبـیێ هـۆ دەگریـت ؟ وتـم : نـازانم ، هـۆی چـیە هـیچ شـتێکی نـوی لە ژیانمدا روینەداوە .
بەبێـدەنگی لامـدا دانیشـتبوو چـاوە گەورە رەشـەکانی لە تـاریکی ئەو شـەوەدا ئەمبینـی خێـرا خێـرا پـر دەبـوون لە فرمیسـك و بەسـەر رومەتەکانیـدا دەهـاتنە خـوارەوە و بە لێوەکان راپێچی دەکردنە ناو دەمی چاوەکانی ووشك دەبـوەوە پـاش کەمێکـی تـر بەهەمـان شـێوە و دووبـارە چاوەکـانی پـر دەبوەوە لەئـاو ئەمجارەیـان دڵۆپێـك فرمیسـك هـاتە خـوارەوە و کەوتە سەر لووتی دەسـتە سـرەکەی دەرهێنـاو سـری . پێم وت : مامۆستا ئیقبال ئەوە دەگریت ؟ وتـی : نەخیـر . دەسـتە سرەکەی شاردەوە و رووە گرژەکەی نەما و خەنـدەیەکی کـرد .
ئەو شـەوە ئـارام و بیـدەنگ بـوو جـووڵە نەبـوو ، جیهـانیش تاریکبوو نەخـۆر دیـار بـوو نە مانـگ ، روبەروی یەکتـر و چاومـان بریبوە یەك و سـەرنجی چاوەکـانیم دەدا رەشـینەکانی چـاوی روو لە زیـاد بـوون بـوو ، وەك ئەوەی تیشـکیکی سـحری لە جێگەیەکـی نادیـارەوە لەسـەر زەوی بـوونی نـیە هەروەك لە ئاسمانیشـدا نـیە لەبەرئەوەی شـەوان زەوی تـاریکە و ئاسمانیش رەشە بەبێ خۆر و مانگ .
چـاوم لەسـەر چاوەکـانی جێگیـر کـرد و دەسـتم درێـژ کـرد و دەسـتەکانیم گـرت لەو بەریەك کەوتـنەدا ئەو چێـژەی کە لە میـژە و لە تەمەنـم درێژتـرە هـاتەوە جەسـتەم شـتێکم بیـر هـاتەوە پـێش ئەوەی لێوەکـانم بیـدرکینن بیـرم چـوەوە . دڵـم

سست بوو لە پاشان لێدانەکانی زیادی کرد وەك ئەوەی لە شتێک دەترسیت کە ونبووە ، بە هێزیکی پتەو دەستیم گوشی . لە دوایدا هەر جاریك دەمبینی دەمویست شتێک بڵێم بەڵام بیرم دەچوەوە ، لێدانەکانی دڵم لە لێدانی ترسی دەکرد و هەستم دەکرد حەزدەکەم دەستم درێژ بکەم تا دەستی بگرم بەڵام مامۆستا ئیقبال دەچووە پۆل و دەهاتە دەرەوە بێئەوەی سەرنجم بدات ، گەر سەیریشی بکردمایە وەك هەر قوتابیەکی دیکەی ئاسایی لێی دەروانیم .
لە ناو جێگەکەشمدا پێش ئەوەی بنووم هەر بیرم دەکردەوە . ئایا مامۆستا ئیقبالم لە بیرکرد ؟ لە پاشان ( وفیە ) جێگەکەی لە جێگەکەم نزیك دەکردەوە و دەیوت : چیت لە بیرکرد ؟ منیش پێم دەوت : نازانم وفیە . ئەنجا وفیە دەیوت : فردۆس تۆ لە دونیای داڵغەدا دەژیت . دەموت : هەرگیز ، هەرگیز وفیە روویدا . ئەویش لێی ئەپرسیم : چی روویدا ؟ هەوڵم دەدا پێی بڵێم چی رویداوە ، بەڵام نازانم چۆن پێی بڵێم، یان شتێک رویداوە و بیرم چوبوەوە یا هەرگیز هیچ شتێک روینەدابوو .
چەند چاوەکانم لێك دەنا لە هەوڵی ئەوەدا شتێک بیتەوە یادم چاوە گەورە رەشەکانی مامۆستا ئیقبالم دەهاتە پێشچاو و سەرنجم دەدان و لێیان وورد دەبوومەوە رەشینەی چاوی بە قەبارەی زەوی گەورە دەبوو سپێنەکەشی هێندەی قەبارەی خۆری لێ دەهات ، چاوەکانم رێشکە و پێشکەی دەکرد و وینەکانی لەبەرچاومدا بە جۆریك تێکەڵ دەکرد و ینەی روخساری باوکمم لە دایکم جیا نەدەکردەوە لە دەم و چاوی مامم و محمدین لە ئیقبال و وفیە کاتێکیش لە ترسی

نابینــابوون چــاوم دەکــردەوە دەم و چــاوی وفــیەم دەبینــی لە تــاریکیەکەدا هێشــتا نەنوســتووە . پێــی دەوتــم : فــردۆس تــۆ مامۆستا ئیقبالت خۆشدەویت ؟ بە ســەر ســورمانەوە دەمــوت : من ؟ دەیوت : بەڵێ تـۆ ، لە تـۆ زیـاتر کـی ؟ دەمـوت : وفـیە هەرگیــز ئەویــش دەیــوت : ئەی کەواتە بــۆ هەمــوو شــەویك باسـی دەکەیت ؟ منیش دەموت : من ؟ هەرگیز ، رویـنەداوە . تۆ هەروا شت زل دەکەیت وفیە . وفـیەش دەیـوت : مامۆســتا ئیقبـال مامۆســتایەکی باشــە . منـیش دەمـوت : بەڵـێ بەڵام ئەو ئافرەتە ، ئایا دەبیت ئافرەتێکم خۆشبویت ؟

تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ چەند ڕۆژیکی مـابوو ، چیتـر وفـیە باسـی خۆشەویستەکەی بـۆ نەدەکـردم ، زەنگـی نوسـتنیش شــەوان وەك جـاران خێـرا لێــی نەدەدا ، هەمـوو شــەویك لە هــۆڵی خوێنــدنەوە لەگەڵ وفــیە و کچــانی تــر ســـەرقاڵی خوێندنەوە و خۆ ئامادە کردن بووین بـۆ تـاقیکردنەوە ، بیگومـان ئافرەتە چاودیرەکەش ناو بە ناو دەهاتوو دەچوو تـا بزانیـت کـی ســەرقاڵە دوور لە خوێنـدنەوە هەر کاتێـک یەکێـک لە کچەکـان ســەری بەرز بکــردایەتەوە یــا پشــتێکی ڕاســتکردایەتەوە ئەم ئافرەتە ئەنیشتە سەری و بە دەست سەری شـۆر دەکـردەوە بۆسەر میزەکە .

ویــرای هەمــوو ئەمــانەش مــن هەر حەزم لە کۆشـــش و خوێندنەوە بوو لە پاشان ئەنجامی تاقیکردنەوەکان ئاشکرا کـرا من دووەمی قوتابخانەکەم و حەوتەمـی وڵات بـووم ، شــەوی ئــاهەنگی دابەشــکردنی بروانــامەی دەرچــوون کە لە هــۆڵی قوتابخــانە ســازکرا بــوو ســەرجەم کەســوکار و بـاوك و دایکـی قوتابیان ئامادە بوون ، بەریوەبەر ناوی منی خوێندەوە تا بچـمە

سـەر شـانۆ بەڵام نەمتـوانی وەڵامـی بـدەمەوە و هەسـتمە سـەر پـێ دووبـارە نـاومی خوێنـدەوە منـیش هەر لە جـێگەی خـۆمەوە دەنگـم بەرز کـردەوە و وتـم : بەڵـێ ، ئیتـر هەرچـی دانیشـتوانی نـاو هـۆڵەکە بـوو لایـان کـردەوە بەلای منـدا و چاویـان تیبـریم ، بەریـوەبەر وتـی : هەسـتە سـەر پـێ ئەنجـا وەڵام بـدەرەوە ، نەمزانـی چـۆن هەسـتام ، لە پاشـان لیـی پرسیم کە بەخیوکەرت لە کوییە ؟ نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە خەریکبوو شتێک بڵێم هۆڵەکە بیـدەنگ بـوو و هەمـووان رویـان کردەوە بۆ پێشـەوە بۆلای بەریـوەبەر و پشـتیان کـردە مـن ، لە ناکـاو دەسـتێک دەسـتەکانی گـرتم و بەرە و شـانۆ بـۆلای بەریوەبەر پەلکیشـی کردم بە نیو ئامادەبوانـدا . دەمـم کـردەوە شتێک بڵێم : وەڵامی دامەوە و وتی : فـردۆس هـیچ مەڵـی ، لە پاشان گەیشتینە سـەر شـانۆ بـۆ لای بەریـوەبەر مامۆسـتا ئیقبـال ئیمـزای کـردوو بروانـامەی سـەرکەوتنمی لە سـەروو هەمـوانەوە وەرگـرت و پاشـان بەریـوەبەر کـۆی نمرەکـانمی خوێنـدەوە ، گـوێم لە غەڵبەغەڵـب و دەنـگە دەنگێـک بـوو لە هـۆڵەکەوە دەهـات لە چەپـڵە لێـدانی دەکـرد ، لە دوایـدا بەریـوەبەر دەسـتی درێـژ کـردوو پـاکەتێکی رەنگـا و رەنگـی بەسـتراو بە قەیتـانیکی سـەوزی دامـی توانـام نەبـوو لێـی وەرگرم وەك بەنج بـوبم وابـوو مامۆسـتا ئیقبـال لێـی وەگـرت و بەنـاو ئامادەبوانـدا گیـرامیەوە بـۆ جـێگەکەی خـۆم بروانـامە و پاکەتەکەم لەسـەر باوەشـم دانا . ساڵی خوێندن کۆتایی هـات و باوکــان و بەخیوکــاران هــاتن و هەر کەس کچــی خــۆی وەرگـرتەوە ، بەریـوەبەر بروسـکەیەکی کـرد بـۆ مـامم ئەویـش هـات منـی وەرگـرت ، لە دوای ئـاهەنگەکەوە ئیتـر مامۆسـتا

ئیقبالم نەبینیەوە ، کاتێک ئەو شەوە زەنگی خەوتن لێیدا مـن نەنوستم و چوومە تاریکی جاری پێشـوو و بە تەنیا دانیشـتم تاریکـاییەکم بەرچـاو کەوت وەك سـیبەریکی گەورە وابـوو زۆر ترســام بەرەو ئەو تــاریکیە چـــووم ( عەرەق ) ســـەرتاپا جەستەو ناو دەسـت و قژیشـمی داگرتبـوو ، کـاتێکیش نزیـك بـوومەوە بە هێمنـی بـانگم کـرد : مامۆسـتا ئیقبـال هـیچ وەڵامێک نەبوو .
پێش ئەوەی قوتابخانەش جێبهێڵم سەرتاپایم دایە بەر ریـژنەی سـەرنج بەسـەر دەرگـا و پەنـجەرە و دیوارەکانـدا وەك ئەوەی چاوەروانی شتێکبم چاودیریم بکات و لە پر لە پەنجەرەیەکەوە ماڵئاواییم لێ بکات ، لە هەر چرکەیەکیشدا بی هیـوا دەبـووم بەڵام هەر چاوە چاوەم بوو ، مـامم گەیشـتە شـەقامی پـێش قوتابخانە و منیش لەگەڵیـدام دەرگـای قوتابخانەمـان لە دواوە لـێ داخـرا وتـم : مـامە تکـات لێـدەکەم یەك چـرکەی تـر چاوەروانم بکە . چـوومەوە بەر دەرگـاکە داخرابـوو هێنـدەی تـر بـی هیـوا بـووم پاشـان بە چەنـد هەنگـاویکی قـورس هـاتم بەدوای مامـمـدا ، ئـافرەتێکیش لەگەڵیـدایە هاوسـەریتی ئەم منداڵانەش منداڵی ئەون و لەم خانووە بچکۆلانەیەشـدا تەنها قەنەفەیەکی بچکۆلانەی شکاوە لە ژووری نـانخواردن جـێگەی نوستن و حەوانەوەی منە هیچ جیاوازییەکی نـیە لەگەڵ ژوورە تـاریکەکەی قەتابخـانە جـگە لەو چـرپە چـرپەی نێـوان مـامم و هاوسـەرەکەی نەبێت .
مامم ئەیوت : لەو بروایەدا نیم بتوانم بەو بروانامە دواناوەندیە کـاریکم بـۆی دەسـتکەویت ناشـزانیت لەسـەر ئـامیری چـاپ بنوسیت ، کاری بەریوەبردن و سکرتاریش نازانیت .

ئامۆژنیشم ئەیوت : ئەی کەواتە چی دەزانیت ؟
- هیچ شتێک . ئەم قوتابخانە گشتیە دواناوەندیانە هیچیان فیرناکەن .
پێویست بوو بمخستایەتە قوتابخانەیەکی ناوەندی بازرگانی .
- پێویست بوو ، کرداری رابردووە ، ئێستا چی دەکەیت ؟
دەتوانیت لامان بمینیتەوە تاکو کاریکی بۆ دەدۆزمەوە .
- بەم شێوەیە و بەم حاڵە دوور نیە یتێک بۆ دەی پێ نەچیت ، خانوەکەش تەنگەبەرە و گرانیە و ئەویش هێندەی منداڵەکان زیاتر دەخوات .
هاوکاریت دەکات لە کار و باری ناو ماڵ و منداڵەکان .
- خزمەتکاریکی باشمان هەیە و خۆم خواردن دروست دەکەم و پێویستمان پێی نیە.
با هاوکاریت بکات لە چیشت لێنان تۆش بەتاڵ ئەبیت بۆ بەخیوکردنی منداڵەکان .
- خواردنیم بەدڵ نیە . خواردن بە دەستە مامە شێخ ، دەستی باش نیە و بە دڵم نیە . بیرت چوەوە بامییەکی لێنا وتت ئەمە بامی نیە راهاتویت بامێی دەستی خۆم بخۆیت ؟
دەتوانیت لەجیاتی ( سعدیە ) ی خزمەتکار دایبنێیت و خەرجی ئەو خزمەتکارەمان بۆ بگەڕیتەوە .
- ناتوانیت بیخەیتە جێی سەعدیە چونکە سوك و سۆڵ و خواردنی کەمە و خەوی سوکە دڵی گەرمە ، بەڵام ئەو لەشی قورسە و دڵی ساردە .
ئەی چار چیە ؟

- دەتوانین رزگارمان بیت لە دەستی بە ناردنی بۆ زانکۆ و لە ناوخۆیی لەگەڵ قوتابیەکاندا بژی .

زانکۆ ؟ بۆ ئەوەی لای پیاوانەوە دانیشێت ؟ شێخیکی بەریز و پیاوێکی ئاینی وەك من کچی براکەی بنیریت لەگەڵ پیاواندا تێکەڵ بیت ؟ پاشان خەرجی زانکۆ لە کوی بینم لە کرینی کتێب و جلوبەرگ بەم گرانیە و بەرز بوونەوەی نرخەکان بە خێرایی و مووچەی حکومەتیش ساڵی چەند فلسێك زیاد دەکات ؟

- مامە شێخ من بیریکی باشم لایە .

چیە ؟

- شێخ محمودی خاڵم پیاوێکی باشە و مووچەی باش وەردەگریت منداڵی نیە و لەوەتەی خوالێخۆشبوی ژنی مردووە بەتەنیا دەژی . گەر بیت و فردۆس شوو بکات بە شێخ محمود ژیانیکی شادی و کامەرانی لەگەڵدا بەسەر دەبات و ئەویش ژنیکی گوێرایەڵ و خزمەتکار و بەریوەبەری ماڵی دەستدەکەویت . مامە شێخ فردۆس گەورە بووە و ئەبیت شوو بکات . مانەوەی هەتا ئێستا بەبێ شوو مەترسی هەیە . فردۆس هەژارە و نەزانە خەڵکی ساختەچی و دەست بریش زۆرن.

من لەگەڵتام بەڵام شێخ محمود لە تەمەندا لەو گەورە ترە .

- کی دەڵێ گەورەیە ؟ ئەو تەنها ئەمساڵ خانەنشینکراوە و فردۆسیش منداڵ نیە . هاوریی ئەو چەندین ساڵ لەمەوبەر شویان کردووە و منداڵیشیان بووە . پیاوێکی بە تەمەنی وەك شێخ محمودیش بۆی باشتر دەبیت لە

گەنجیــك گاڵتەجــاری پێبکــات و لێــی بــدات . خۆشــت هەڵسوکەوتی گەنجی ئەمرۆ باش دەزانیت .

لەگەڵتام بەڵام ئەو عەیبباریەی دەم و چاوی .

- عەیبە ؟ کی دەڵێ ئەوە عەیبەیە ؟ مامە شێخ پیاو تەنها گیرفانی عەیبباری دەکەت .

ئەی گەر هاتوو فردۆس پێی قایل نەبوو ؟

- بــۆچی قایــل نابیــت ؟ هەلــی لەمە باشــتری دەســت ناکەویت . خـۆت دەزانیـت فـردۆس ناشـرینە و هـیچ جـۆرە میراتــی و پــارەیەکی بــراوە و مــووچەیەکی نــیە لە شــێخ محمودمان باشتر بۆی دەست ناکەویت .

ئەی شێخ محمود پێی قایل دەبیت ؟

- گەر من قسەی لەگەڵـدا بـکەم قایـل دەبیـت ، ئەشــتوانم داوای مارەییەکی قورس بکەم .

چەند ؟

- ( 100 ) جونەیە تا ( 200 ) گەر پێی بیت .

گەر هـاتوو ( 100 ) ی دا ئەوا خیـریکە و لای خـواوەیە و داوای زیاتر ناکەم .

- سەرەتا لە ( 200 ) ە وە دەست پێدەکەم ، خۆت دەزانیـت پیــاوێکی پــولەکیە و چەنــدین کــاتژمێر لەســەر فلســیك ئەریسیت .

گەر قایـل بیـت بە ( 100 ) جونەیـە ئەوا لای خـواوە نیـردراوە و منــیش ئەتــوانم ئەو قەرزەی لەســەرمانە بیــدەمەوە و ئەوەی لێی دەمینیتەوە چەند پارچەیەك جلوبەرگی ژێـرەوە و یەك دوو ( کراس ) ی بۆ فردۆسـی پێ ئەکـرین نابیـت بەو جلـوبەرگەی لەبەریدایە بیدەینە شـوو .

- خەمــی نــاو مــاڵ و خانوشـــت نەبێــت . شــێخ محمــود خـــانوەکەی گەورەیە و نـــاو مـــاڵەکەی ســــەردەمی خوالێخۆشـــبووی وەك خـــۆی مـــاوەتەوە بە تەواوی و هەمـووی تـۆکمەیە وەك ئیشـی ئەمـڕۆ نـیە کە تەنها بـۆ بازرگانیە .

زۆر ڕاستە .

- بەو خــوایە مــامە شــێخ ئەم فردۆســە کە بــرازاتە خــوا خۆشـی دەویت بەختـی زۆر بـاش و مسـۆگەر دەبیـت گەر بیت و شێخ محمود پێی قایل بیت .

تۆ دەڵێی قایل دەبیت ؟

- بیگومـان پێـی قایـل دەبیـت ، بـۆ قایـل نابیـت ؟ هێنـدەی بەســە دەبیـتە هاوســەری شــێخیکی بەریـز و پیـاوێکی ئاینی وەك تۆ .

لەوانەیە شـێخ محمـود بیـر لە ئـافرەتێکی دەوڵەمەنـد بکـاتەوە بیهینیت خۆت دەزانیت پارە پەرستە .

- مامە شێخ تۆ خۆت بە هەژار دەزانیت ؟ حاڵمـان لە حـاڵی زۆر کەس باشترە و سوپاسی خوا دەکەین .

بەڵێ ، بەڵێ ، سوپاسی دەکەین لێی بە زیاد بیت .

مـن راکشـابووم گـوێم لـێ بـوو مـامم دەیـوت : سوپاســی دەکەین لێی بە زیاد بیت ، ئەمدیو و ئەو دیوی دەسـتی خـۆی ماچ دەکرد ، لەسـەر و ئەو دیوارە بەرزەی ژوورەکەی نێوان مـن و ئەوان دەنگــی ئەو ماچــانە دەهــاتنە بەر گــوێم ، هێنــدەی نەدەبرد ماچی دەستی خۆی دەگوازرایەوە بۆ ماچی دەسـتی ژنەکەی لەپاشــان قــوڵی ئەنجـا قاچەکـانی ، گـوێم لێبـوو کە قوڵی یا قاچی رادەکێشا ئامۆژنم دەیوت : بەسـە مـامە شـێخ

بەس ؟ ئەویــش بە دەنگێکــی ئــارام و لەســەرخۆ وەڵامــی دەدایەوە : بەســەی چــی ئــافرەت ؟ لە پاشــان تەقەتەق و جیرەجیری سیسەمەکەی ژێریان دەهات و گـوێم لە هەناسـە برکیی مامم دەبوو ، ئامۆژنیشم بە دەنگێکی پچر پچر دووبارە دەیوت کە بەسە مامە شێخ گوناحە بـۆ وا دەکەیـت . ئەویـش لە وەڵامدا دەیوت : گوناحی چـی ئـافرەت ؟ مـن مێـردتم و تـۆ ژنمــی ، تەقەتەقــی سیســەمەکە زیــادی دەکــرد ، دوو جەستەی گەورە جووت دەبـوون لێـك جیـا دەبـونەوە ، کـردەی سێکسـی ئەنجـام دەدرا . ئەنجـا جـوڵەکە وەك جـوڵەی شـێت خێـرا دەبـوو هێنـدە پـتەو بـوو سیسـەم و دیـواری نێـوان مـن و ئەوان و قەنەفەکەی ژێریشـمی دەلەرانەوە منـیش وەك ئەوان هەناسە برکیم پـێ دەکەوت ، لە پـاش خـاوبوونەوەی ئەوان و منیش چاوەکانم ئەچوونە خەویکی قوڵ .

بەیانیـانیش کاتێـک خـواردنی بەیـانیم ئامـادە دەکـرد بـۆ مـامم هەر کە مـامم ســەیری دەکـردم کاتێـک کوپێـك چـا یـا شــیرم بدایەتە دەست من رووم لێ لادەدا و سەرنجم نەدەدا .

پاشــان چــاوەروانم کــرد تــا مــامم چــووە دەرەوە ، چــوومە ژوورەکەی خــــۆم و لەژێــــر قەنەفەکە پێڵاوەکـــانم و جلــــی نوستنەکەم و بروانـامەی تەواوکردنـی قۆنـاغی ناوەنـدییەکەم کــۆکردەوە و عەزیەکەی دەرەوە و پێڵاوەکــانم لەپــێ کــرد ، ئامۆژنم لە چیشـتخانە سـەرقاڵی خـواردن دروسـتکردن بـوو ( سعدیە ) ی خزمەتکاریش لە ژووری منداڵەکان بـوو خـواردنی ئەدانی ، کچێکی مامم زۆر بچکـۆلانە بـوو نـاوی ( هـالە ) بـوو هێشـتا فیری قسە کـردن نەبوبـوو تەنـانەت نـاوی منیشــی بە تەواوی بـۆ نەدەهـات هەر دەیـوت ( دۆس

. دۆس ) بە راکــردن هــاتە ژوورەکەم بە چــاوە رەشـــەکانی سـەرنجی سـەرتاپای ئەدام لە پێڵاوەکـانمەوە بـۆ جلەکـانم بـۆ جانتاکەی شانم ، زۆرجار ( هالە ) دەهاتە لام و تەنها ئەو بـۆم پڕێـدەکەنی لە نیـو منـداڵەکانی مامەمـدا و دەچـووە سـەر قەنەفەکە و دەیوت: ( دۆس . دۆس ) منیش دەموت : ( بەڵێ . هـالە ) کە دایکیشـی بـانگی دەکـرد بە راکـردن دەچـوو بە دەنگیەوە ( هالە ) زۆر سەرنجیدام بە گوێیـدا چرپانـدم ( هـالە جاریکی تر دیمەوە ) ئەویـش تونـد کراسـەکەی بەری گـرتم و دەیـوت : ( دۆس . دۆس ) منـیش وینەیەکـی خـۆمم دایە دەسـت تـاوەکو بیخڵافیـنم ئەنجـا ووردە ووردە رۆیشـتم و دەرگاکەم لە دوای خۆمەوە داخست ، گـوێم لێـی بـوو لەودیـو دەرگـاکەوە هەر هـاواری دەکـرد : ( دۆس . دۆس ) بە پـێ پلیکانەکاندا هاتمە خوارەوە و بە خێرایی چوومە سەر شـەقام و ئاوریکم دایەوە کەسم بەدی نەکرد دەسـتمکرد بە رۆیشـتن ، سـەریکم هەڵبـری وەك ئەوە وابـوو یەکەمجـارم بیـت بە شـەقامدا بـرۆم یـاخود هەر بـوە و مـن نەمبینیـوە ، راهـاتبووم بەشـەقامدا بـرۆم بەڵام ئەمجارەیـان بـۆ جێگەیەکـی دیـاریکراو نەدەچـووم ، نەمـدەزانی بەرەو کـوی مـل دەنـیم . چاوەکـانم کردەوە لە شەقامەکاندا خەڵکیکی زۆر لە هاتوچۆدا بوون پەلە پەل دەم و چاویـان هەڵبزرکـاو بنـی پێڵاوەکانیـان داخـوراو مانـدویتی بە روخسـاریانەوە دیـاربوو ، خەڵکیکـی تـر لە نـاو ئوتومبیلدا دەم و چاویان کراوە گۆشتن و چاوبز و تێر و تەسـەل ، خەڵکیکی تریش هەبـوون لە نـاو پاسـە قەرەباڵغەکانـدا مـن دەم و چاویـانم دەبینـی سـەریان بەیەکەوە نوسـابوو , تێـک ترنجـا بـوون و لە پەنجەرەکـانەوە تەنهـا نـاوقەدی خەڵکـت

دەبینـــــی ، کـــــاتێکیش کە ئەو پاســــانە لە ویســــتگەیەك ڕادەوەستان بە زەحمەتێکی زۆر خەڵکی دادەبەزیـن دەمبینـی دەم و چاویکی زەرد هەڵـگەڕاوی عەڕەقـاوی دوو چـاوی پـر لە تاسە و ترس .
ســەرم ســورما لەم ریـژە زۆرەی خەڵکـی لە شــەقامەکاندا ، ســەر ســورمانم زیـادی کـرد کاتێـک کە بەشــەقامەکاندا وەك نابینایەك دەرۆیشتن کەسیان نەدەبینی و کەس نەیـدەبینین ، پێم سەیر بوو منـیش یەکـێکم لەوان ، هەسـتم بە خۆشـیەك کـرد وەك منـداڵیك چـۆن سـەرەتا جیهـان دەناسـیت بە چەنـد چــرکەیەك فــری دەدریــتە جیهــانیکەوە هەرگیــز نەیبینیــوە و نەیناسیوە ، ئەویش کاتی لەدایك بوون .
کاتێــک شــەو داهــات نەمزانــی بچــمە کــوی تــاکو تیایــدا ڕۆژ بکەمەوە زۆر ترســام ، زۆر هـیلاك بوبـووم برسـیتیش زۆری بـۆ هێنابووم پاڵمدا بە دیواری ماڵیکەوە و سەرنجی شـەقامەکەم ئەدا لەبەرچاومــدا وەك دەریــایەکی فــراوان وابــوو منــیش پارچەیەك بەرد تیی فریـدراوم ، پـارچە بەردیـك دەخزیـت , ئەو خەڵکە دین و دەچن بە هەزاران هەزار چاو من نابینن .
تەنهــا دووچــاو نەبێــت بە هێمنــی بەســەرتاپامدا هەڵــگەڕا پێڵاوەکـانم ، سـکم ، سـنگم ، گەردنـم ، لێوەکـانم ، دواجـار لەسـەر چـاوم جێگیـر بـوون . تەزویەکـی سـاردی جەسـتەمی داگرت لە تەزوی مردنی دەکرد ، خۆم ریك کـردەوە و تینمـدایە خۆم تاکو ئەو ترس و لەرزە دەرکەم ، تەنها دووچـاوە و هیچـی تر چەقۆ نـین . پاشــان رووم وەرچەرخانـد و هەنگـاوم نـا بەڵام هەســـتمکرد ئەو دووچـــاوە لە پشـــتەوە لـــێم دەروانیـــت ، هەنگاوەکـانم خێـرا کـرد تـاکو گەیشـتمە دوکانیـك رونـاکیەکی

زۆری لێوە دەهات خۆمکرد بەناو خەڵکی قەرەباڵخی نیو دوکانەکە ، پاش کەمێک لە دوکانەکە هاتمە دەرەوە و دوای ئەوەی بە باشی سەرنجیکی ووردی شەقامەکەمدا و دووچاوەکەم نەبینی بە خێرایی رامکرد .
ئاواتە خواز بووم خێرا بگەمە ماڵی مامم . نازانم چۆن بەرگەی ژیانم گرت لە ماڵی مامم و چۆن توانیم لەگەڵ ئامۆژنم هەڵبکەم و چۆن شومکرد بە شێخ محمود ، بەڵام هەموو ئەمانە لەو ترسە کەمتر بوون کە لەو دووچاوەوە پێم گەیشت هەر کە دەهاتەوە بیرم تەزوە ساردەکە جەستەمی دادەگرت ، نەمدەزانی چاوەکان چ رەنگ بوون رەش بوون یان سەوز ، شێوەیانم نەزانی گەورە و فراوان بوون یا تەسك ، ئەو دووچاوەم لە نیو خەڵکی بۆ جیا نەدەکرایەوە هەر کاتێک کە بە شەو یا ڕۆژ برۆیشتمایە لەسەر شەقامەکان بەملاولای خۆمدا دەمروانی وا هەستم دەکرد کە لە ناکاو ئەو دووچاوە لە زەوی هەڵدەقوڵیت و لەبەردەممدا قوت دەبنەوە .
لە پاشان لە ماڵی ماممەوە گواسترامەوە بۆ ماڵی شێخ محمود ، ئێستا لە جیاتی قەنەفە تەختەکە سیسەم و جێگەیەکی خۆشم هەیە ، هەر کە لە سەری رادەکشام تا لە هیلاکی گەسکدان و چیشت لێنان و خاوینکردنەوەی ئەو خانووە گەورەیە و ناوماڵە جەستەم بحەویتەوە ، شێخ محمود دەهات ، ئەو لە شەست ساڵ تیپەری کردبوو منیش نۆزدەم تەواو کردبوو ، لە ژێر لێوی خوارەوەی برینیکی گەورە هەبوو وشك بوو پاش چەند ڕۆژیك ئەتەقی و تەر دەبوو چەند دڵۆپێك خوین وچەند دڵۆپێکی تر زەرداوی لێ دەهات کە ئەو برینە ووشك دەبوەوە لێ دەگەڕام ماچم بکات هەستم بەو برینە

دەكرد وەك كیسیك لەسەر لێو و دەم و چاوم ، ئەو ڕۆژانەش كە تەر دەبوو دەم و لووتم لێ دوور دەخستەوە برینەكەی بۆنیکی ناخۆشی لێدەهات لە سەگی تۆپێوی دەکرد .
شەوانیش دەست و قۆلی تیوە دەئالاندم و دەستە عەڕەقاویەكەی بەسەرتاپای جەستەمدا دەگیرا وەك ئاژەڵیكی برسی چەندین ساڵ خواردنی نەدرابیتی و پاشان كە خواردنت دایە دەفرەكەش بلێسیتەوە .
خواردنی زۆر كەم و سست بوو ، برینەكەی نەیدەهێشت شەویلگەكانی بە ئاسانی بجوڵین ، گەدەشی پڕ ببوو خواردنی زۆر هیلاكی دەكرد ، ئەو كەمەی دەخوارد بەڵام دەبوایە لە دوای هەموو خواردنیكەوە قاپەكەی بلستایەوە و هیچی پێوە نەهێشتایە ، پاشان سەنجی دەدام كاتێک خواردنم دەخوارد گەر لێم بمایەتەوە دەیخوارد و دەیبۆڵاند بەسەرمدا كە زیادە رەویم كردووە لە لێناندا ، زیادە رەوی نەبوو و خواردنیشم لێ نەدەمایەوە بەڵام حاجەت شتێكی خواردن هەر پێوە دەمینیتەوە كە دواتر لە كاتی شۆریندا بە ئاو و سابوون لێ دەبیتەوە ، ئەو بە زۆری دەزانی پاش ئەوەی خەوی  لێ دەكەوت بە هیواشی دەست و قۆڵ و جەستەم لە ژێری دەردەهێنا و دەچووم بۆ حەمام و دەم و چاوم و دەمم و سەرتاپا جەستەم چەند جاریك بە ئاو و سابوون دەشۆرد .
خانەنشین بوو بیكار و بی هاوری بوو ، دەرەوەی نەبوو نەشدەچووە چایخانە و قاوەخانەكان لە ترسی ئەوەی پارەی چاو و قاوە نەدات ، ئیتر بە درێژایی ڕۆژ جگە لە شەو هەر لە ماڵەوە لەگەڵمدا بوو سەرنجی دەدام و گەر لە چیشتخانە كەوچكیك زیاد رۆنم بكردایەتە خواردنەوە هاواری دەكرد وا

ڕۆنەکە تەواو بوو یـان لە کـاتی شـۆریندا گەر شـتێکی کەم لە تایت و سـابوون برژایە ئەوا دنیا پێی دەزانـی ، کـاتێکیش خـۆڵ ریژ دەهات خۆڵ ببات پێش ئەوەی خۆڵەکەی بداتی جـوان نـاو تەنەکەکە دەگەڕا .
جارێکیـان لە تەنەکەکەدا پاشـماوەی کەمێـک خـواردنی بینـی فریدرابوو ، بە دەنگێکی وا هاواریکرد دراوسـیکان گوێیـان لێبـوو ، لە پاشـان دەسـتی کرد بەلێدانم بەهۆ و بەبێ هۆ .
جـاریکی تریـان بە پـاژنەی پێڵاوەکـانم لێیـدام و دەم وچـاوم و جەسـتەمی بریندار کرد منیش ماڵەکەم جێهێشـت و چـوومەوە ماڵی مامم ، مامم پێی وتم : هەموو مێردیك لە ژنەکەی دەدا ، ئامۆژنیشـم وتی : کە مامم لێیداوە . منیش پـێم وت : مـامم شێخیکی بەریزە و پیاوێکە شـارەزایی تەواوی هەیە لە بـواری ئاییـندا و هەرگیـز لە ژنەکەی نـادات . ئامۆژنیشــم وتــی : ئەو پیـاوەی شــارەزای ئـایین بیـت ئەو لە ژنەکەی دەدات چـونکە دەزانیت کە ئایین ریـگەی فەرامـۆش کـردووە مێـرد لە ژنەکەی بــدات و پێویســتە ژن هــیچ کــاردانەوە و وەڵامێکــی نەبێــت و گـوێڕایەڵ بیـت . نەمزانـی چـی وەڵامـی ئـامۆژنم بـدەمەوە ، پـێش ئەوەی خزمەتکـارەکەی مـاڵی مـامم خـواردنی نیـوەرۆ دابنیت مامم بردمیەوە ماڵی مێردەکەم ، مێـردەکەم خـواردنی خۆی خواردبوو لێی نەپرسـیم کە ئایا خواردنم خواردووە یـان نـا ، ئیـوارەش لێــی نەپرســیم و بە تەنیـا نــانی خــۆی خــوارد ، بەیانی خواردنم بۆ ئامادە کرد ، دانیشــت بەرامـبەرم بێـئەوەی قســەم لەگەڵ بکــات یــا ســەیرم بکــات ، زۆرم برســی بــوو دەستم برد لە خواردنەکەی بەردەمـم خـواردن بخـۆم دەسـتم گەیشــت و نەگەیشــتە دەمــم هــاواری کــرد بەســەرمدا و

هەستایە سەرپێ و وتی : بۆچی لە ماڵی مامت گەڕایتەوە ؟ مامت ناتوانیت چەند ڕۆژێك نانت بدات ؟ ئێستا زانیت كە تەنها منم ئەتوانم لەگەڵت بژیم و لەگەڵت هەڵكەم ، تەنها من نانت دەدەم . بۆچی قینت لێمە ؟ بۆچی دەم و چاوت لە دەم و چاوم دووردەخەیتەوە ؟ ئایا شێوەم ناشرینە ؟ بۆنم ناخۆشە ؟ بۆچی لووتت دووردەخەیتەوە هەركاتێک لیت نزیك بكەومەوە ؟ پاشان وەك سەگی برسی سەرم نیشت ، برینەكەی تەربوو بەڵام رووم نەگۆری و دەم و چاوم و جەستەم وەك تەختەیەكی بیگیان خستە بەردەستی ، جاریكی تریش بە گۆچانەكەی دەستی زۆری لێدام تاكو خوین لە لووت و گوێم هات ، ماڵەكەم جێهێشت بەڵام ئەمجارە نەچووم بۆ ماڵی مامم . بەو ئازار و برینەوە بەناو شەقامەكاندا دەرۆیشتم ، هیچ كەسێک منی نەدەبینی ، خەڵكی لەسەرقاڵی خۆیاندا منیان نەدەبینی یا بە پەلە بەپێ دەرۆیشتن یان سواری ئوتومبیل بوبوون ، وەك نابینا وابوون هەركەس لە خەمخواردنی خۆیدایەتی ، منیش شەقامەكە لەبەردەممدا وەك دەریایەكی بی بن وایە و وەك بەردیك فریدراومەتە ناوی شەپۆلەكانی لێرە بۆ ئەوی ئەمگوێزیتەوە . هیلاك بووم و لەپێ كەوتم لەسەر كورسیەك كە لەسەر یەكێک لە شۆستەكان دانرابوو دانیشتم . بۆنیكی خۆشی قاوە هاتە بەر لووتم و هەستم كرد زمانم وشكە و برسیمە ، كاتێک شاگردی چایخانە هاتەلام و لێی پرسیم چی ئەخۆمەوە وتم : بە ئەرك نەبێت پەرداخیك ئاو ، بە چاویكی پر قیزەونی لێی روانیم و وتی : ئیرە شوینی خیرخوازی كردن نیە برۆ بۆ ( سیدە زینب ) نزیكە لەوی

ئاویکی زۆری لێیە بۆ هەموو کەسێک . سەرم بۆ هەڵبری و سەرنجیکی دەم و چاویدام و وتی : ئەو جێگە لێدانانە چیە کی وای لێکردووی ؟
ویستم پێی بڵێم بەڵام نەمتوانی بە دەستەکانم دەم و چاوم شاردەوە و دەستمکرد بە گریان . شاگردەکە جێی هیشتم و پاش کەمێک هاتەوەلام و پەرداخیك ئاوی لەگەڵ خۆی بۆ هێنابووم ، هەوڵمدا ئاوەکە بخۆمەوە نەمتوانی وەك ئەوەی شتێک بەری قورگی گرتبم ، ئاوەکە لە نێوان لێوەکانمەوە هاتە خوارەوە ، پاشان خاوەن چایخانەکە هاتەلام و لێی پرسیم : ناوت چیە ؟ وتم : فردۆس . وتی : ئەو جێگە لێدانانە چیە بە دەم و چاوتەوە ؟ کەس لێی داویت ؟ ویستم پێی بڵێم بەڵام دەنگم دەرنەدەهات هەنسکم دەدا و فرمیسکەکانم دەخواردەوە و بە ئاستەم هەناسەم بۆ دەدرا .
وتی : فردۆس ئیسراحەت بکە ، ئێستا کوپێك چای گەرمت بۆ دەهینم ، برسیت نیە ؟
دەم و چاوم بۆ هەڵنەبری بەڵام تەزوەکانی دەنگی دەچوەوە سەر دەنگی باوکم کە هەموو جاریك لێی دەپرسیم ( برسیت نیە ؟ ) پاش ئەوەی نانی دەخوارد و لە دایکمی دەدا ، بۆ یەکەمجار بوو هەستم کرد کە باوکم پیاوێکی باش بووە و خۆشم ویستووە بێئەوەی بزانم و بیری دەکەم ، گوێم لێبوو پێی وتم : باوکت ماوە ؟ وتم : مردووە پاشان بۆ یەکەمجار بوو بۆ مردنی باوکم بگریم . دەستێکیدا بە شانمدا و وتی : ئەی دایکت ماوە ؟ وتم : نەخیر . پاشان جانتاکەم کردەوە و بروانامەی تەواو کردنی ناوەندیەکەم دەرهێناو وتم : من

دەرچــووی ناوەنــدیم دەتــوانم بچــمە دواناوەنــدی یــاخود لە سـەرەتایی کار بکەم یان لە دواناوەندی هەر کاریك بکەم .
ناوی ( بەیومی ) بوو ، کاتێک سـەرم بـۆ هەڵبـری هەسـتم بە تـرس نەکـرد لـوتێکی زلـی خـواری هەبـوو لە لـوتی بـاوکمی دەکرد ، پێستیشـی لە پێسـتی بـاوکمی دەکـرد گەنـم رەنـگ بوو ، چاوەکانیشـی هێمن دیار بوو لەوە ناچیـت کەس بکوژیـت ، دەسـتەکانیشـی ئارام بوون لەوە نەدەچوو لێـدان و دڵ ڕەقـی بـزانن ، پێـی وتـم : کە لە دوو ژووردا دەژی و مـن دەتـوانم لە ژووریکدا لەگەڵیدا بژیم تاکو کاریکم دەست دەکەویت .
لە کــاتی رۆیشـــتنەوەماندا بــۆ مــاڵەوە لەبەردەم دوکــانیکی بەقاڵیـدا وەسـتاو وتـی : حەزت لە پرتەقـاڵە یـان یوسـفی ؟ ویسـتم وەڵام بـدەمەوە بەڵام بیسـوود بـوو ، چـونکە پێشـتر کەس لێی نەپرسیبووم حەزت لە پرتەقاڵە یا یوسـفی . بـاوکم هەرگیـز میـوەی نەدەکـری مامیشــم و مێردەکەشــم کاتێـک دەیـانکری پرسـیان نەدەکـرد ، نەشــم دەزانـی کە ئایـا زیـاتر حەزم لە پرتەقاڵە وەك لە یوسفی و بە پێچەوانەوە .
بۆ جاری دووەم لێی پرسیم حەزت لە پرتەقاڵە یان یوسـفی ؟ وتـم : یوسـفی پـاش ئەوەی یوسـفي کـری زانـیم کە زیـاتر حەزم لە پرتەقـاڵە وەك لە یوسـفی بەڵام لە شـەرمی ئەوەی کە پرتەقاڵ هەرزانترە لە یوسفی وتم یوسفی .
( بەیـومی ) دوو ژووری هەبـوو تیایـدا دەژیـا بەرامـبەر بـازاری ماسـی فرۆشـەکان ، لە بازاری ماسـی فرۆشـەکان یـا ماسـی یان کەرویشك یا گۆشتم بۆ دەکری و بـۆم لێـدەنا . شـەو و ڕۆژ کــاری دەکــرد بیخــواردن ئێــوارانیش دەهــاتەوە خــواردنیکی چەوری باشـــی دەخـــواردوو لە ژوورەکەی خـــۆی لەســـەر

سیسـەمەکە دەنوسـت و منـیش لەسـەر جـێگەیەك لەسـەر زەوی ژوورەکەی تر .
یەکەمین شـەو لەگەڵی چوومەوە زستان بـوو سـاردبوو ، پێـی وتم : تۆ لەسـەر سیسـەمەکە بنوو من دەچـمە سـەر زەویەکە بەڵام قایل نەبووم و هاتمە جـێگەکەی خـۆم ، کەچـی هـات و دەسـتی گـرتم و بە راکێشـان بـردمیە سـەر سیسـەمەکە و وتـی : تـۆ لێـرە بنـوو ، زۆر بە شـەرمەوە لەگەڵـی چـووم و یەکەمجارم بوو کەسێک لەگەڵمدا وا هێمن و خەمخـۆر بیـت ، لە زستاندا بـاوکم جـێگە گەرمەکەی لای تەنـورەکەی بۆخـۆی هەڵدەبژارد و مامیشم لەسەر سیسەمەکەی خۆی دەخەوت و منـیش لەسـەر قەنەفەیەکـی تەخـتە و مێردەکەشـم تـاکو نانمان دەخوارد سەرنجی قاپەکەی بەردەممی دەدام .
کە بردمیە لای سیسەمەکە وتـم : نـاتوانم لەسـەر سیسـەم بنووم ، ئەویش وتی : ناشتوانیت لەسـەر زەوی بنویـت ، مـن هەر شـەرمم دەکردوو ئەویش هەر دەستی بە قۆڵمەوە بـوو ، دەسـتی گەورە و پەنجەکـانی درێـژ بـوون وەك دەسـت و پەنجەی مامم چاوم نوقاند ، هەستم بە چێژیکی بەرکەوتنـی دەسـتیم بە جەسـتەم کـرد کە پێشـتر و لە کۆنـدا هەسـتم پێکردبوو لێم وون ببوو یان هەرگیز نەمزانیوە ئایا ئازارە یـان چێـژ . پاشـان لە سیسـەمەکەیدا نوسـتم سـەرتاپا زسـتان و هـاوینیش تەنهـا یەکجـاریش لێـی نەداوم و هـیچ کـاتێکیش سەرنجی قاپەکەی بەردەممی نەدەدا هەر کاتێک ماسـیم بـۆ لێبنـایە کلـك و سـەرم بۆخـۆم دادەنـا کەرویشـکیش هەمـوو گۆشـتەکەم بـۆ ئەو دادەنـا و تەنهـا سـەرم بـۆ خـۆم دادەنـا و پێشـئەوەی ئەو لە خـواردن بیـتەوە مـن هەڵەسـام ، ئەو

کاتانەی دەشچووم بۆ بـازار سـەرنجی ئەو قوتابیـانەم دەدا کە بەسـەر شـەقامەکاندا دەڕۆیشـتن ، جارێکیـان لەبەردەم چەنـد قوتابیەکـدا وەسـتام و پـێم وتـن : کە منـیش وەکـو ئیـوە بڕوانـامەی دەرچـوونم هەیە لە ناوەنـدی ، کەچـی پێکەنـین و گوێم لێبوو یەکێکیان چرپانـدی بە گـوێی ئەوی تریـان و وتـی : ئەمە شـێتە ، بـڕوانە قسـە لەگەڵ خـۆی دەکـات پاشـان وردبـوونەوە لە جلـوبەرگی بەرم و ئەو بـۆن ماسـیەی لـێم دەهات ، بەڵام مـن لەگەڵ خـۆم قسـەم نەدەکـرد بەڵکـو مـن وتم : کە منیش بڕوانامەی دەرچوونم هەیە .
کاتێکیش ئەو شـەوە بەیومی هـاتەوە پێمـوت : مـن دەرچـووی ناوەندیم ئەمەویت کار بکەم ، پێی وتـم کە چایخـانەکە پـڕە لە گەنج و هەمووش هەڵگری بڕوانامەی زانکـۆیین . وتـم : بەڵام من پێویسـتە کـار بـکەم ، نـاتوانم بەم شـێوەیە بەردەوام بـبم . لێـی پرسـیم بێـئەوەی سـەیرم بکـات ، مەبەسـتت چـیە لە وشـەی ( بەم شـێوەیە ؟ ) بە پچـر پچـریکەوە پێمـوت : نـاتوانم لەم خانوەدا لەگەڵ تۆ بژیم ، لەبەرئەوەی من ئـافرەتم و تـۆش پیاوی خەڵکیش قسە ئەکـات تـۆ بەڵێنـت پێـدام کە بمیـنمەوە تاکو کاریکم بۆ دەدۆزیتەوە ، بە تورەییەکەوە وەڵامـی دامەوە و وتی : ئەنجا چی بکەم ؟ لە ئاسمانەوە کاريك دروسـت بـکەم ؟ وتم : تۆ بە درێژایی ڕۆژ سـەرقاڵی کارکردنیـت لە چایخـانە و بوارت نیە بۆ کار بگەڕییت بۆ من ، ئەمـرۆ خـۆم دەچـمە دەرەوە بەشوین کاریکدا دەگەڕیم .
من دەنگم هێمن بوو ، سـەرم شـۆر کردبوەوە بۆ سـەر زەویەکە ، بەڵام ئەو بەرامبەرم ڕاوەستاو زللەیەکی لێدام و وتی : ئەی بەرەڵڵای سـەر شـەقامەکان ، بی رەوشـت دەنگت بەسـەرمدا

بەرز دەکەیـــتەوە ! لەپـــێ دەســـتی گەورە و بەهێـــز بـــوو ، بەهێزترین لەپ بوو بەر دەم و چاوم کەوت ، وایکرد سـەرم گیـژ بخـوات و دەم و چـاوم راتەکینیـت زەوی و ژوورەکە لەبەرچـاوم دەســورانەوە بە دەســتم ســەرم گـرت تــاکو ویــنەی زەوی و ژوورەکە هـاتنەوە جـێگەی خۆیـان ، پاشـان سـەرم هەڵبـری و چاوم برییە چاوی .
وەك ئەوە وابوو یەکەمجارم بیت چاوی ببینم ، دووچـاوی رەش سـەرنجی چاوم دەدەن ، ئەنجا بە هێمنی جوڵان بەسـەر دەم و چاوم و گەردنم و دابەزین بۆ سـەر سـنگم و سـکم و دواجـار لە خوار سکمەوە لە نێوان رانەکـانم جێگیـر بـوون ، تەزویەکـی سـارد جەسـتەمی داگـرت وەك تەزوی مـردن وابـوو ، ئەنجـا دەستم درێژ کرد تاکو سکم و رانـم بشـارمەوە بەڵام بەیـومی بە سـکیدادام و لە هۆش خۆ چووم ، ئیتر وایلێهات کە دەچـووە دەرەوە دەرگــای خــانوەکەی لەســەر دادەخســتم و لەســەر زەویەکە ئەنوستم لە ژورەکەی تـر ، لە نیـوەی شـەودا کاتێـک دەهـــاتەوە بەتـــانیەکەی لەســـەر لادەبـــردم و خـــۆی دەدا بەسـەرمدا ، منیش لە ژێریدا جووڵەم نەدەکرد وەك بیگیانیـك ، جارێکیـان هەسـتمکرد لەشــی لە جـاران قورســترە و بــۆنی هەناسـەکانی لە هەناسـەی بەیومی نەدەکـرد ، کاتێـک چـاوم کردەوە دەم و چاویکی جیاواز لە بەیـومیم بینـی . پێمـوت : تـۆ کییت ؟ وتی : بەیومیم ، وتم : تۆ بەیومی نیت ؟ وتی : من و بەیومی یەك شتین . ئەنجا لێی پرسـیم : کە ئایـا هەسـت بە چێـژ دەکەم ؟ وتـم : دەڵێــی چــی ؟ دووبــارە لێــی پرســیم : هەست بە چێژ ئەکەم ؟ ترسام بڵێم نەخیر چاوم لێکناو وتـم : بەڵێ ، پاشـان ددانەکانی لە گۆشـتی شـانم و سنگم و سـکم

گیر کـردوو لەبەرخـۆیەوە ئەیـوت : ئەی کچـی .. ، وشـەیەکی بە دایکم ووت نە دەمتوانی گوێی لێبگـرم نە بیڵـیمەوە ، بەڵام دواتــر پــاش ئەوەی زۆرم ئەبیســـت لەســەری راهــاتم ، زۆرم دەبیست لە بەیومی و هاوریکانی وام لێهات منیش دەمـوتەوە کاتێک بەیومی دەرگاکەی لەسەر دادەخستم منیش لێمـدەدا و هاوام دەکـرد ئەی بەیـومی کـوڕی .. خەریکبـوو قسـەیەکی ناشرین بە دایکی بڵێم بەڵام زانیم هەڵەیە و بە بـاوکیم وت لە جیاتی دایکی .
جارێکیــان یەکێــک لە دراوســیکان بینیمــی دەگریــام لە ژێــر دەرگـــاکەوە ، پـــاش ئەوەی هـــۆی گریـــانەکەی لێپرســــیم بەســـەرهاتەکەم بـۆ گیـرایەوە ئەویـش لەگەڵـم دەسـتی بە گریان کردوو وتـی : داوای پـۆلیس دەکەم بەڵام مـن سـڵم لە وشـــەی پــۆلیس دەکــردەوە و داوام لێکــرد دارتاشــیك بینیــت دەرگاکە بکاتەوە ، دارتاشـەکەی هێنـاو دەرگـاکەی کـردەوە لە خانوەکەی بەیومی هـاتمە دەرەوە و بەسـەر شـەقامەکاندا تـا توانیم رامکرد ئێستا شـەقامەکان بۆمن باشـترین حەشـارگەن ناو بە ناویش ئاورم دەدایەوە بۆ دواى خۆم تاكو بـزانم بەیـومی دیــار نــیە و بەردەوام رامــدەکرد ، کاتێــک ڕۆژ ئــاوا بــوو لە نــاو شـەقامیکدا خۆم بینیەوە نەمدەزانی کوییە ، شـەقامیکی پـاك و خــاوین بــوو ، بەســەر نیلــدا دەیروانــی لەمــبەر و لەوبەری شـەقامەکەشــەوە درەختــی بەرز هەبــوون ، خانوەکــانی ئەو ناوچەیە بە باخچەی جوان جوان و پەرژیـن رازینرابـوونەوە ، هەســـتم بە هەڵمژینـــی هەوایەکـــی پـــاك کـــرد بەســـنگمدا دەچووە خواری کوڕسـیەکی وەك سـەکۆم لە چیمەنتـۆ بینـی لەسـەر دانیشـتم و رومکردە ئەو شـەماڵە خۆشـەی لێـی دەدام

، چاوەکـانم نوقانـد ، بەڵام گـوێم لە دەنگـی ئافرەتێـک بـوو لە تەنیشــتمەوە ئەهـات و دەیـوت : نـاوت چـیە ؟ چـاوم کـردەوە بینیم ئافرەتێک لە تەنیشتمەوە دانیشتووە ، لەچکیکی خـوری سـەوزی بەسـەر شانەوەیە و چاوەکانیشـی سـەوز دەچـنەوە و ئەمـبەر و ئەوبەری نیلـیش بەهـۆی سـەوزی بـاخچە و دار و درەختەکـانەوە شـین و سـەوز تـێکەڵ بوبـوون ، سـەوزیکی تێریان دروستکردبوو هەر چـوار لام سـەوز دەچـووە ، هەسـتم دەکـرد لەو سـەوزاییەدا وون و نـوقم بـووم وەك ئەوەی لەگەڵ ئەو ئـاوە لێکمانـدا بیـت و منـیش نوسـتبم ، لەو ئـاوەدا مەلە دەکەم و نوقم دەبم یێئەوەی تەر ببم خۆم شل دەکەم بمبـات بەرە و ناخ و قوڵایی یان بە هێمنـی سـەرمخات بۆسـەر رووی خۆی یێئەوەی بجوڵیم .
هەستمکرد جەستەم قـورس بـووە وەك ئەوەی بنـووم ، بەڵام دووبارە دەنگەکە هاتەوە گـوێم ، دەنگێکـی نەرم خەواڵـوو : تـۆ هیلاکیت . خۆم ڕاست کردەوە و وتـم : بەڵـێ . لە چاوەکانیـدا جۆریك لە رق دروست بوو سەوزاییەکەشـی تـاریکتر بـوو وتـی : ئەو سـەگە چی لێ کردویت ؟ راچڵەکـیم وەك چـۆن یەکێـک لە خەودا رادەچڵەکیـت : کیـیە ؟ لەچـکەکەی دایەوە بەسـەر شـانیدا و وتی : کام سەگیان ، هەموو سـەگن و لە ژێـر نـاوی جـۆرا و جـۆردا: محمـود ، حسـنین ، فـوزی ، ئیبـراهیم ، عەوەزین ، بیومی .. پێم برێ : بەیـومی ! . پێکەنینیکـی تونـد دایگـرت بینـیم ددانەکـانی سـپیێ و وورد بـوون و لە نێوانیانـدا ددانیـك ئـاڵتون بـوو : مـن هەموویـان دەناسـم ، کـی سـەرەتا دەسـتی پێکـرد : باوکـت ، بـراکەت ، خاڵـت ، مامـت ؟ .. جەسـتەم لەسـەر سـەکۆ چیمەنتۆکە ڕاسـت بـوەوە و وتـم :

مامم ! دووباره پێکەنـی و لەچـکەکەی فریـدایە دواوە و وتـی : ئەی بەیومی چی لێکردووی .. پیت نەوتم نـاوت چـیە ؟ وتـم : فردۆس ، ئەی تۆ ، کییت ؟ خۆی ریـك کـردەوە و وتـی : مـن ( شـەریفە سـەلاح ئەلدین ) م و هەموو خەڵکی دەمناسـن .
بە درێژایـی رۆیشـتنمان بـۆ ماڵەوەیـان چیرۆکـی خـۆمم بـۆ گیـرایەوە . شـەقامی نیلمـان جێهێشـت و چـوینە کـۆلانیکی تەنگەبەر و پاش کەمێـک سـەرکەوتینە باڵەخـانەیەکی بچـووك کاتێـــک ســـواری بەرزکەرەوە ( مەســـعەد ) بـــووین جەسـتەم دەلەرزی ، پاشـان لە جانتـاکەی کلیلێکـی بچـوکی دەرهێنا و خۆم لە خانویەکی خنجیلانەی پاك و خـاوینی پـر لە ناوماڵ و بە فەرش داپۆشـراو بینـی ، تـارمەیەکی گەورەشـی هەبـوو بەسـەر نیلـدا دەیروانـی ، بردمـی بـۆ حەمـام تـا خـۆم بشـۆم ، فیری کـردم چـۆن ئـاوە سـارد و گەرمەکە بـکەمەوە ، پاشان جلوبەرگی خۆیی بۆ هێنام جلوبەرگیکی نەرم و ناسـك بۆنی عەتری جۆرا و جۆری لێ بەرز دەبوەوە ، کاتێـک قـژی بـۆ شـانە کـردم جلـوبەرگەکەی بەرمـی ریکخسـت , هەسـتمکرد دەسـت و پەنـجەی نەرمە ، هەمـوو شـتێک لەمـلاولام نەرم و ناسـکە چـاوم دەنوقانـد و خـۆم شـل دەکـرد بـۆ ئەو نەرمـی و هێمنـــیە ، جەســـتەم وەك جەســـتەی منـــدالێك لە کـــاتی لەدایکبوندا چەند نەرمە ئاوا نەرم بوبوو .
کاتێـک چـاوم کـردەوە خـۆم لەبەردەم ئاوینەیەکـدا بینـیەوە ، هەستمکرد سـەر لە نوی لەدایـك بـومەتەوە بە جەسـتەیەکی پـــاك و خـــاوینی نەرمەوە ، جلەکانیشـــم پـــاك و نەرمـــن ، خانوەکەش خاوینە و هەواش خـاوینە .. هەناسـەیەکی قـوڵم هەڵمـژی تـاکو سـنگم پـر بـکەم لەو هەوا پـاك و بـیگەردە ،

بەدەوری خۆمــدا ســورامەوە بینــیم وەســتاوە بە دووچــاوەوە ســەرنجم دەدا تیشــکیکی بەرەنگــی ســەوز رەنگــی نیــل ، رەنگی ئاسـمان و دار و درەختـی لـێ دەهـات . خـۆم خسـتە نێوان چاوەکانی ، باوەشـم پێدا کـردوو وتـم : تـۆ کییـت ؟ وتـی کوا دایکت . وتم : دایکم لە میژە مـردووە . وتـی : خوشـکت . وتم : نە خوشـکم هەیە نە برا ، هەمـوو وەك جـوجەڵە وابـوون کە مـردوون . وتــی : هەمـوو کەس دەمریــت فـردۆس ، مــن دەمرم تۆش دەمریت ، گرنگ ئەوەیە بزانیت چۆن دەژیت .
وتم : چۆن بژیم ؟ ژیان سەختە . وتی : تۆ سـەخترتربە لە ژیـان فردۆس . ژیان سـەختە ناژی هەرکەس لەو ســەخترتر نەبێـت . وتــم : بەڵام تـۆ ســەخت و دڵ ڕەق نیـت ، ئیتـر چـۆن دەژیـت شــەریفە ؟ وتــی : مــن ســەختم و دلێشــم زۆر ڕەقە , وتــم : بەڵام تۆ نەرم و ناسکیت . وتی : پێستم نەرم و ناسـکە بەڵام دڵـم ڕەق و پێـوەدانم کوشــندەیە . وتــم : وەك مــار ؟ وتــی : بەلـێ ، وەك مـار ، مـار و ژیـان یەك شــتن فـردۆس . گەر مـار نەزانیت ماریـت پێـوەت دەدا ، گەر ژیـانیش زانـی پێـوە نادەیـت ئەو پێوەت دەدا .
وام لێهات بوومە قوتابیەکی بچووکی بەر دەسـتی شـەریفە ، چــاوم بە ژیــان هەڵــدەهینیت و تیشــك دەخــاتە ســەر ئەو رواوانەی لە ژیانمــدا و لە منداڵێشــمدا نەمبینیــوە ، چەنــد بەشـیکی لە جەستەمدا پێ ناسـاندم کە پێشتر نەمدەناسـی لەگەڵ چەنــد شــێوەیەك لە دەم و چــاوم کە پێشــتر بەدیــم نەکردبوو و هەستم پێ نەکردبـوو ، زانـیم کە دووچـاوی رەش هەیە تیشـکیکی تیدایە چـاوی تـر بـۆلای خـۆی رادەکیشـێت ، زانـیم کە لـوتم گەورە نـیە و بەڵکـو نەرم و لەبـارە و جەسـتەم

پـتەوە و رانەکـانم و سـمتم پـتەو و ماسـولکەکانی بەهێـزن ، زانـیم رقـم لە دایکـم نەبـووە و مامیشـم خۆشنەویسـتووە هیچکـامیش لە بەیـومی و هاوریکـانیم نەناسـیوە ، شـەریفە وتی : بەیـومی و هەمـوو ئەوانەی وەك بەیـومی وان بەهایـان نەزانیویت لەبەرئەوەی خۆت بەهای خۆتت نەزانیـوە ، فـردۆس پیـاو بەهـای ئـافرەت نازانیـت ، ئـافرەت خـۆی بەهـای خـۆی دیـاری دەکـات .. چەنـد بەهـات گـران بیـت پیـاو هەسـتت پێـدەکات و زیـاترت پـێ دەدات ، گەر نرخەکەشـی پـێ نەبـوو لەخەڵکی تری دەدزیت و پیت دەدا .

بەسـەر سـورمانیکەوە پرسـیم : شـەریفە ئایا مـن بەهـام هەیە ؟ وتی : تۆ جوان و رۆشنبیریت . وتـم : رۆشـنبیر ؟ مـن تەنهـا هەڵگری بروانامەی ناوەندیم . وتی : ئەنجـا ئەوە کەمە ؟ مـن تەها سـەرەتاییم تەواو کردووە . بە وریاییەکەوە وتم : شـەریفە تۆ بەهات هەیە ؟ وتی کە بیگومان ، پیاو بۆی نیە دەسـتم بـۆ بەریـت تـاکو گـران نەدات . تـۆش لە مـن گەنجتـر و رۆشـنبیر تریت هیچ کەس ناتوانیت دەستت بۆ بەریت تا ئەو کـاتەی دوو هێندەی من نرخت نەدا .

وتم : بەڵام من ناتوانم هـیچ لە پیـاو داوا بـکەم . وتـی : هـیچ داوا مەکە ئەوە ئیشـی تۆ نیە .. جێی بهیڵە بۆ من .

ئایا ئەبیت نیل و ئاسمان و دار و درەخت بگۆریت ؟! بەڵام مـن گۆرام ئەی بۆچی نیل ناگۆریت رەنگـی دار و درەخـت ناگۆریـت ؟

هەموو بەیانیەك پەنـجەرەکەم دەکـردەوە نـیلم ئەبینـی و دار و درەختەکـانم بەدی دەکـرد تیشـکیکی سـەوزی تـاریکی دەدا هەستم بە ژیان پێ پـتەو دەکـات و هێـزی لەش و ئەو خـوینە

گەرمەی بە ناو دەمارەکاندا لە هاتن و چوندایە زیاد دەکات ، گەرمایی بە جەستەم دەگەیەنیت ، گەرمیەکی نەرم وەك نەرمی ئەو جلوبەرگە حەریرەی لەبەرمدا بوو لەگەڵ ئەو جێگە حەریریەی سەر سیسەمەکەم ، بۆنیك وەك بۆن و بەرامی گوڵ وایە لوتم پر دەکات ، جەستەم شل دەکرد تاکو لە نیو ئەو گەرمی و نەرمی و بۆن عەترەدا نوقم بیت ، قاچەکانم درێژ دەکرد لە ژێر ئەو بەتانیە حەریریەی ئەمدا بەخۆمدا و دەم و چاویشم لەناو سەرینە حەریریەکەدا نوقم دەکرد تاکو نەرمی دەچووە لوت و گوێمەوە .
لە شەویشدا تیشکی مانگ دەکەوتە سەر جەستەم رەنگی سپێ حەریری پەنجەی پیاویش سپێ حەریریە ، نینۆکەکانی خاوین و سپێ حەریریە ، وەك نینۆکەکانی بەیومی رەش نەبونەتەوە بە چا ، یا نینۆکەکانی مامم لە ژێریدا قۆریکی رەش هەبوو .
چاوەکانم لێکدەنا و جەستەم جیدەهێشت لەناو ئەو تیشکە سپێەدا ، هەستم دەکرد پەنجەی حەریری بەسەر جەستەمدا دەگەڕیت بەسەر لێوەکانمدا دادەبەزیت بۆ گەردن و شان و ملم بە نێوان مەمکەکانم و سنگمدا بۆ سەر سکم و شۆر دەبیتەوە بۆ نێوان رانەکانم ، هەست دەکەم جەستەم دەوروژیت ، وروژانیك ، چێژیك سەرەتاکەی وەك ئازاریك وایە ، چێژیك هێندەی تەمەنم کۆنە و لە کۆندا ئەو چێژەم ناسیوە و هەر لە کۆنیشدا بیرچۆتەوە ، ئەو چێژە لە تەمەنم دوور ترە ، وەك ئەوەی لە برینیکی کۆنەوە بیت یاخود هەستی پێ بکەم لە دەرەوەی جەستەی منە و لە جەستەی یەکێکی تردایە .

ڕۆژێکیان بە شەریفەم وت : شەریفە بۆچی هەست ناکەم ؟ شەریفە وتی : فردۆس ئیمە کار ئەکەین ، کار کارە ، کار و هەست تێکەڵ مەکە . وتم : بەڵام شەریفە من دەمەویت هەست بکەم ! وتی : فردۆس هەستکردن لە ئازار زیاتر هیچی ترت ناداتی .
وتم : باشە نابیت چێژیك هەبیت ، تەنانەت گەر کەمیش بیت ؟
پێکەنی و ددانە سپەکانیم بەدیکرد لە نێوانیاندا ددانە ئاڵتونەکە . وتی : هەست بە چێژ ناکەیت کاتێک بریانی مریشك دەخۆیت ؟ ئایا هەست بە چێژ ناکەیت ئەو جلە حەریریە نەرمەت پۆشیوە ! هەست بە چێژ ناکەیت لەم خانووە گەرمە خاوینەی بەسەر نیلدا دەروانیت و ئاسمان و دار و درەختی لێوە دیارە دەژیت ؟ هەست بە چێژ ناکەیت هەموو بەیانیەك کاتێک پەنجەرەکە دەکەیتەوە سەوزایی و جوانی سرشت بەدی دەکەیت ؟ ئەم هەمووەت بەس نیە ؟ بۆچی داوای زیاتر دەکەیت ؟! ئەوەی داوام دەکرد زۆر نەبوو چاوچنۆکیش نەبوو بەڵام من کاتێک پەنجەرەکەم دەکردەوە نیلم وەك جاران نەدەبینی لەبەر چاویشمدا بوو بەڵام هەستم پێ نەدەکرد وەك ئەوەی نابینابم و هیچ نەبینم ، لوتیشم وەك چاوم بۆنی هیچ عەتر و بۆنیکی خۆشی نەدەکرد ، هەستم بە جلوبەرگی حەریر و سیسەمی حەریر و خواردنی زۆر باش نەدەکرد ، هەموو شتێک هەبوو بەڵام وەك ئەوە وابوو لای من نەبێت .
لە ماڵ نەدەچوومە دەرەوە ، بەڵکو لە ژووری نوستنەکە دەرنەدەچووم ، شەو و ڕۆژ وەك لەخاچدراو لەسەر

سیسـەمەکەم بـووم ، هەر کـاتژمێرەش پیاوێـک خـۆی دەکـرد بەژووردا ، پیاوانیکی زۆر ، لە کویـوە دەهـاتن هەمـووش ژنیـان هەبـوو ، رۆشـنبیر و خوێنـدەوار بـوون هەمـوو سـەر و جانتـای چەرمی قورسیان پێ بوو ، گیرفانەکانیان پر ، لەشیان قـورس ، ورگیـان قـورس و لە رادە بەدەر تێـر و تەسـەل عەڕەقیکـی زۆریان پێوە بوو بەر لوتم دەکەوت بۆنی ناخۆش بـوو وەك بـۆنی ئـاویکی وەسـتاو . لـوتم دوور دەخسـتەوە بەڵام بە زۆر دەم و چاویـان دەهێنـامەوە پێشـەوە و نینـۆکە سـپێە درێژەکانیـان لە جەستەم گیر دەکردوو لێوەکانم جووت دەکرد تا ئـازار و دەنگـم بگـرم بەڵام بیهـودە لێوەکـانم دەکـرانەوە هەر دەنگێکـی لێـوە دەهـات ، لە پـر بە هەمـوو گیلیەکیـانەوە بە دەنگێکـی پـر هەناسە برکی پێـی دەوتـم هەسـت بە چێـژ دەکەیـت ؟ لێـوم قوت دەکردەوە تاکو تفیکی لێ بکەم ، کەچی لێـومی بە ددان دەگرت و هەسـتم بە لینجـیەك دەکـرد دەهـاتەوە نـاو دەمـم و منیش بە زمانم دووبارە دەمکردەوە ناو دەمی .

تەنها پیاوێک گیل نەبوو لێی نەپرسیم کە ئایا هەسـت بە چێـژ دەکەم ، بەڵام پێـی وتـم : هەسـت بە ئـازار ناکەیـت ؟ وتـم : بەلێ . وتی : ناوت چـیە ؟ وتـم : فـردۆس . ئەی تـۆ ؟ وتـی : فوزی . وتم : چۆن زانیـت ئـازارم هەیە ؟ . وتـی : لەبەرئەوەی هەسـتت پـێ دەکەم بەسـەر سـورمانیکەوە وتـم : هەسـتم پێ دەکەیت ؟ . وتی : بەلێ ، ئەی تۆ هەستم پـێ دەکەیـت ؟ . وتم : من هەست ناکەم . وتی : بۆچی ؟ . وتم : نـازانم ، شـەریفەش دەلیـت: کـار کـارە و هەسـتی تیـادا نـیە . پێکەنینیکـی کـورتی کـردوو مـاچیکی لێـوی کـردم و وتـی : شـەریفە دەستت دەبریـت و پـارەت پـێ پەیـدا دەکـات ، تەنهـا

ئازار بۆ تـۆیە . گریـام فرمیسـکەکانی سـریم و باوەشـی پێـادا کـردم و نـاوچەوانی مـاچ کـردم بە هێمنـی وتـی : حەز لە نوستن دەکەیت ؟ وتـم : بەلـێ . وتـی : لە باوەشـمدا بنـوو . وتـم : ئەی شـەریفە ؟ وتـی : لە شـەریفە مەترسـە . وتـم : ئەی تۆ ؟ لێی ناترسیت ؟ پێکەنینیکی تری کورتی کردوو وتی : ئەو لێم دەترسیت .

مـن هێشـتا هەر لە جـێگەدا بـووم و نوسـتبووم ، چەنـد دەنگێکی هێمنی وون دەهاتە بەر گوێم لە نێـوان ئەو دیـوارەی ژوورەکەی من و شـەریفەی جیا دەکردەوە ، گوێم لێبـوو لەگەڵ پیاوێکدا قسەی دەکرد دەنگـی بەلامەوە نەناسـراو نەبـوو وەك ئەوەی پێشـتر ئەو دەنگەم بیستبیت .

فوزی لێم دەسینیت ؟!

- شـەریفە من دەیخوازم .

تۆ کەس ناهینیت فوزی .

- ئەوە لە رابردوودا ، ئێسـتا کەوتـومەتە تەمەنەوە پێویسـتم بە کوڕیك هەیە .

بۆ ئەوەی زەوی و ئاسمانتی بۆ ببیت بە میراتی ؟!

- گـاڵتەم پـێ مەکە شـەریفە . گەر بمویسـتایە ئەبـوومە خـاوەن ملیۆنـان، بەڵام مـن پیـاوێکم حەزم بە چێژەکـانی ژیانە و پارە پەیداکردن و پاشـەکەوت کردن هیچ شـتێکیش نە پارە نە خۆشـەویستی نامکاتە کۆیلە .

فوزی خۆشـت دەویت ؟!

- شـەریفە بەرای تۆ من توانـای خۆشـەویسـتیم هەیە ؟! تـۆ پیـت نەوتـم کە مـن پیـاوێکم توانـای خۆشـەویسـتیم لەدەسـتداوە ؟

فوزی تۆ خۆشەویستی نازانیت ناشی هینیت تەنها ئەتەویت لێم زەوت بکەیت وەك چۆن پێشتر کامیلیات برد .
- کامیلیا خۆی لەگەڵم هات .
خۆشەویستی ، وانیە ؟!
- ئافرەتان خۆشیان دەویم . ئیتر من تاوانم چیە ؟
قور بەسەر ئەوەی خۆشی دەوییت فوزی .
- گەر خۆشم نەویت ؟
فوزی ئایا تۆ خۆشەویستی ئەزانیت ؟!
- هەندێکجار .
ئایا منت خۆشویست فوزی ؟!
- گەڕایتەوە بۆ هەمان پرسیار شەریفە ؟ خۆت دەزانیت کاتم نیە فردۆس دەبەم .
نایبەیت .
- ئەیبەم .
فوزی هەرەشەم لێ دەکەیت ؟ بەڵام من چیتر لە هەرەشەکانت ناترسم ، فوزی ناتوانیت پۆلیس بکەیتە سەرم لەبەرئەوەی ئێستا لە تۆ زیاتر خەڵک دەناسم و هاوریم هەیە لە ناو پۆلیسدا .
- ئایا من پیاوێکم دەچمە لای پۆلیس . شەریفە ئایا من پیاوێکی بی توانام ؟!
مەبەستت چیە فوزی ؟!
- خۆت دەزانیت .
فوزی لێم دەدەیت ؟!
- ماوەیەکی زۆرە لێم نەداویت وا دیارە حەز بە لێدان دەکەیت .

گەر لێم بدەیت فوزی لیت دەدەم .
- بەخوا جوانە دەبینین کی دەیباتەوە .
فوزی دەستم لێ بدەیت شەوقیت بۆ دەنیرم .
- ئەم شەوقیە کییە ؟! جگە لە من پیاوێکی ترت هەیە ؟ پیاوێکی جگە لە منت خۆش دەویت شەریفە ؟ دەویریت ؟

ئیتر گوێم لە دەنگی شەریفە نەبوو وەڵام بداتەوە ، دەنگێک هات وەك ئەوە وابوو کەسێک قسە بکات و دەست بخەنە سەر دەمی تا قسە نەکات ، دواتر ئاگام لێبوو دەستی لەسەر دەمی شەریفە لابردوو بەربووەوە دەم و چاوی نەمدەزانی ئەو شەقانە دەنگی ماچ بوون یان زللە ، پاشان گوێم لە دەنگی شەریفە بوو دەیوت : نا فوزی ، نا . ئەویش . ئەویش بە دەنگێکی هێمنانە وەڵامی دەدایەوە : نا .. نای چیتە ئافرەت ؟ ئەنجا سیسەمەکە لە ژێریاندا دەستی بە تەقە تەق و هەڵبەز و دابەز دەکرد گوێم لێبوو شەریفە دەیوت : نا فوزی ، بۆ وا دەکەیت تو پێغەمبەر . ئەویش دەیوت : نا .. ی چی و پێغەمبەری چی ئافرەت ؟ ئەم شەوقیە کییە .. ها .. تا سەری ببرم ! دووبارە سیسەمەکە لە ژێریان دەستی بە هاتن و چوون دەکرد ئەمجارەیان لەرینەوەیان بەهێز تر و خێراتر بوو ، دوو جەستەی بەهێز و پتەو لەسەری زۆرانیان گرتووە و پێکەوە دەلکین و جیا دەبنەوە ، هەناسەشیان وەك هەناسەی شێتی لێهاتبوو زەوی و ژوورەکەش دەلەرینەوە ، تەنانەت لەرینەوە دەگەیشتە ژوورەکەی ئەمدیو بۆلای من ، ئەو لەرینەوەیە گەیشتە منیش لەسەر سیسەمەکەم و بەئاگای هێنام چاوم کردەوە وینەی فوزیم لە تاریکاییەکدا

بینـــی ، دەنگــی هــاتەوە بەر گــوێم کە دەیــوت : شـــەریفە دەستت دەبریت و لەپای تۆ پارەی دەست دەکەویـت . پاشـان دەنگـی شــەریفە کە دەیـوت : گەر لـێم بـدەیت لیـت دەدەم فـوزی . تەواو چـاوم کـردەوە بینـیم لەســەر سیســەمەکەی خۆمم و هیچ پیاوێکیشم لا نیە . بە هێمنـی و لەسـەر نـوکی پـــێم چـــووم بەرە و ژورەکەی شـــەریفە ، بینـــیم لەســـەر سیســـەمەکەی بەبـــێ جلـــوبەرگ راکشـــاوە و فـــوزی لە تەنیشــتیەوەیەتی . گەڕامەوە بـۆ ژورەکەی خـۆم و یەکەمـین کراســـیك کە بـــۆ دەرەوە بشـــێت بە دەســـتمەوە هـــات لەبەرمکردوو جانتا بچکۆلانەکەم هەڵگـرت و چـوومە دەرەوە بـۆ سـەر شـەقام .
کات شـەو بوو دنیـا تـاریکبوو ، شـەوێکی رەشـی بـی مانـگ ، وەرزیـــش زســـتانە و ســـەرمایەکی زۆرە ، شـــەقامەکانی قـاهیرەش کەسـی پێـوە نـیە و چـۆڵە و دەرگـا و پەنجەرەکـان هەموو بە باشـی داخـراون و قـایم کـراون تەنـانەت هەواشـی لێـوە نـاچیتە ژوورەوە ، منـیش بە تەنهـا بەو کۆڵانـانەدا دەرۆم تاریکی و سـەرما لە هەمـوو لایەکەوە تـیم ئـاڵاوە ، بەڵام مـن ناترسم و هەست بەسـەرماش ناکەم چیتر شـەقامی چـۆڵ و تاریــك نامترســینیت ، لەم دنیایەشــدا جــێگەیەك نــیە رووی تیـبکەم ، باشــە ئەبیـت جەســتەم گۆرابیـت خێـرا سـەیریکی پەنجەکـانی دەســتمکرد پەنـجەی خـۆم بـوون درێــژ و باریـك جارێکیان یەکێک لە پیاوان کاتێک دەستی مـاچکردم پێـی وتـم : کە لە ژیانیــدا پەنــجە و دەســـت و مەچەکــی وای نەبینیــوە کاتێک ماچیان دەکەیت هەست دەکەیـت ئەو پەنجـانە هێزیـك و ژێریەکیان تیادایە و زمانیکی هەیە خەریکە بە وەڵام دیت ..

پێکەنیم و پەنجەکانم لە گوێم نزیك کردەوە هیچم نەبیست . دووبارە پێکەنیم گوێم لە پێکەنینی خۆم بوو . سەرم سورما و سەیریکی ئەملاولای خۆمم کرد . ترسام یەکێک گوێی لێم بیت کە پێکەنیم و بزانن شێتم و بمبەن بۆ نەخۆشخانەی عەبباسیە ، کەسم نەبینی ، بەڵام بینیم وا یەکێک لە پیاوانی پۆلیس بەرەو رووم دیت . قۆڵی گرتم و وتی : بۆ کوی دەچیت ؟ وتم : نازانم . وتی : لەگەڵ من دییت ؟ وتم : بۆ کوی ؟ وتی : بۆ ماڵەکەم . وتم : نەخیر ! چیتر متمانە بە پیاوان ناکەم ! جانتا بچکۆلانەکەم کردەوە تاکو بروانامەکەی خۆمی پێشان بدەم وتم : دەگەڕیم کاریکم دەستکەویت لە سەرەتایی یان دواناوەندی هەر شتێک کریم لێی دەست بکەوێت . وتی : من کریی خۆتت دەدەمی وا نەزانی بەبێ کری دەتبەم هیچ پۆلیسیکی تر وەك من نیە ، چەند وەردەگریت ؟ وتم : چەند وەرگرم ؟ نازانم ! . وتی : خۆت گیل مەکە با نەتبەم بۆ بنکەی پۆلیس . وتم : بۆچی دەمبەیت ؟ من هیچم نەکردووە . وتی : تۆ بەد رەوشتیت و ئەرکی من ئەوەیە تۆ و نمونەی تۆ دەستگیر بکەم تاکو نیشتیمانتان لێ پاك بکەینەوە و خیزانە بەرەوشتەکان لە بەد رەوشتی ئیوە بپاریزین ، بەڵام من نامەویت هێزت لەگەڵ بەکار بهینم و ئەتوانین بەبێ دەنگ ریك بکەوین ، یەك جونەیهی تەواوت دەدەمی ، دەڵێی چی؟

ویستم خۆم راپسکینم لە دەستی بەڵام گرتمی ، بە چەند کۆڵانیکی تەنگەبەر و تاریکدا بردمی ، لە پاشان لە دەرگایەکی تەختەی بچکۆلانەوە بردمیە ژوورەوە و لەسەر جێگەیەك پاڵی خستم و جلوبەرگەکەی بەری داناو منیش

چاوم نوقاند ، هەستم بە جەستەیەکی قورس کرد خۆیدا بەسەرمدا عەرەقیکی پێسی کردبووەوە هەناسە برکیی پێکەوت پەنجە و نینۆکەکانی رەش لەریەنەوەی سیسەمەکەی ژێرمان هێندە قایم بوو ئەتوت دنیا دەلەریتەوە ، پاشان چاوم کردەوە و هەستام کراسەکەم لەبەرکردەوە سەری هیلاکم کەمێک شۆر کردەوە لای دەرگاکەوە پێش ئەوەی بڕۆم . گوێم لە دەنگی بوو لە پشتمەوە دەیوت : چاوەروانی چیت ؟ ئەمشەو پارەم پێ نیە ئەمجارە بیتەوە دەتدەمی .

بە کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا دەرۆیشتم و هێشتا دنیاش هەر شەوە ، هەواش ساردە ، بارانیش دایکرد ، خۆڵی سەر زەویەکە ووردە ووردە بووە قوریکی لینج پێڵاوەکانمی گرت هەر ماڵە و کۆمەڵیك خۆڵ و پێسی لەبەر دەرگاکەیدا بوو بۆنیکی پێس چوار دەوریدام هەنگاوەکانم خێراتر کرد بە نیازی ئەوەی لەم گەرەکانە دەربچم و بگەمە سەر جادەی قیر ، هەر شەقامێکی قیر پێ داگرم نەچەقم .

کاتێک گەیشتمە شەقامی قیر ڕێژکراو باران بەخور دەباری چوومە ژێر چەتری وێستگەیەکی پاسەکان . لە جانتاکەم دەستەسریکم دەرهێنا و دەم و چاوم و سەر و قژمم پێ وشك کردەوە ، لە ژێر دەستە سرەکەوە تیشکیکی بەهێز لە چاویدام وامزانی ڕۆژ بووەوە یا تیشکی گڵۆپێ پاسەکانە و هاتوچۆ دەستی پێکرد ، بەڵام هیچکام لەمانە نەبوو ئوتومبیلیك لەبەردەممدا وەستاو پیاوێک بە خێرایی دابەزی و دەرگای ئەمدیوی لای منی کردەوە و بە رەوشتێکی زۆرەوە وتی : فەرموو ، سەرکەوە لەم بەر باران و سەرمایە .

لەسـەرمان هەڵدەلەرزیم ، کراسـەکەی بەریشـم کە زۆر تەنـك بــوو تەواو ئاودامــان ببــوو بە جەســتەمەوە دەلکــا ، لە ژێــر کراســەکەمەوە جـوان مەمکەکـانم دەبینـران بەبـێ سـتیان ، گــۆی مەمکیشــم بــازنەیەکی رەشــی بەرزبــوو ، دەســتی بەریـکەوت کاتێـک سەریخسـتم ، لە خـانووە گەرمەکەشـی کراسەکەم و پێڵاوە قوراویەکانی دانام و جەسـتەمی بە ئـاوی گەرم و سابوون شۆرد و هەڵیگرتم بۆ سەر جێگەیەکی خـۆش ، چـاوم نوقانـد هەسـتم بە قورسـیەك کـرد لەسـەر سـنگم و سـکم ، هەمـان جـوولەی پەنجەکـان بەسـەر جەسـتەمدا ، بەڵام پەنـجە و نینۆکەکـان سـپێ و خـاوین و ناسـك بـوون ، هەناسەکانیش بۆنی عەتریان لـێ دەهـات ، عەڕەقـیش زۆر و لینج بوو بەڵام بۆنی عەتری لێ دەهات ناخۆش نەبوو .

کاتێک چـاوم هەڵهێنـا تیشـکی خـۆر نـوقمی کردبـووم ، بەڵام بەملاولامدا رووم وەرگیرا نـازانم لە کـویم . بینـیم لە ژووریکـی نوســتنی زۆر خۆشــدام ، پیــاوێکی بێگــانەش بەرامــبەرم وەسـتاوە . بە پەلە هەسـتام کراسـەکەم لەبەرکـردەوە لەگەڵ پێڵاوەکانم . کاتێک جانتـاکەم هەڵگـرت تـا بـرۆم دەسـتی درێـژ کــرد بــۆ دەســتم و وەڕەقەیەکــی ( 10 ) جــونەیهی خســتە دەسـتمەوە . جـوولەی دەسـتم کاتێـک پـارەکەم وەرگـرت ئەو گری کویرەیەی کـردەوە ، ئەو پەردەیەی پسـاند کە هەمیشـە ئەو ڕاستیەی لێ شـاردبوومەوە کە لە منـداڵیەوە دەمزانـی و هەسـتم پـێ کردبـوو ، بۆیەکەمجـارم بـوو پـارەیەکی وا زۆر بەتەنهـا بـۆ خـۆم وەرگـرم ، چـونکە بەردەوام لە مـاڵەوە و لە کێڵگە کارم دەکـرد بـاوکم کریـی نەدەدامـی ، تەنـانەت لەگەڵ دایکـم پاشــماوەی ئەو خواردنانەمـان دەخـوارد کە لە بـاوکم

دەمـایەوە ، گەر هـیچ نەمـایەتەوە بـی شـیو دەنوسـتم . لە جەژنـدا منـداڵانم بینـی لە دوکانەکـان شـیرینیان دەکـری ، منـیش چـوومە لای دایکـم و گریـام و وتـم : قرشـیکم بـدەری دایکم وتی : هـیچ قرشـیکم پـێ نـیە ، هەمـووی بە بـاوکتە . چوومە لای باوکم و وتم : قرشیکم بدەری . دای بە دەستمدا و وتـی : پـارەم پـێ نـیە ، پاشـان بـانگی کـردم و وتـی : قرشـیکت دەدەمـی گەر خـوا دەرومـان لـێ بکـاتەوە و گـاکە بفرۆشـم پـێش ئەوەی بمریـت ، بەڵام گـاکە مـرد پـێش فرۆشتنی باوکم وازی لە نوێژ و پارانەوە هێنـا ، بەبـێ دەنگـی مایەوە بە درێژایی جەژن ، هەر کاتێـک دایکـم قسـەی لەگەڵ بکردایە هەڵیدەکوتایە سەری و لێی دەدا .

منـیش داوای قرشـەکەم لـێ نەکـرد ، جەژنـی بچـووك هـات شیرینیم بینی لە دوکانەکان ، بە باوکمم وت : پارەم بـدەری . وتـی : هێشـتا ڕۆژ نەبـۆتەوە داوای پـارە دەکەیـت ؟ بـرۆ ژێـر ئاژەڵەکان گەسك بدە و گوێدرێژەکە باربکە و بیبە بۆ کێڵگە ، ئێـوارە پـارەت دەدەمـی . پـاش ئەوەی لە کـێڵگە گەڕامەوە قرشـەکەی دامـی ، یەکەمـین قـرش و پـارە وەریبگـرم ، یەکەمین قرش بـوو بە مـوڵکی مـن ، خسـتمە دەسـتمەوە و توند گوشیم ئەوە قرشـی مـنە ، قرشـی دایـك و بـاوکم نـیە و هی خۆمە ، هەرچی لێبکەم هی خۆمە ، هەرچی پـێ بکـرم هی خۆمە ، هەرچیم بوی پێـی دەخـۆم ، شـیرینی , حەڵـوا , بنیشت , هەرچیم بویت .

ئەو ڕۆژە سـامـاڵ بـوو ، بە خێرایـی هەنگـاوم دەنـا ، دەسـتی ڕاستم توند نوقاندووە چونکە شـتێکی بەنرخـی تیـادایە ، نەك هەر قرشیکە بەڵکو وەڕەقەیەکە بە ( 10 ) جونەیهی تەواو .

یەکەمینجــارە وەڕەقەیەکــی بەو قەبــارە و نــرخە وەربگــرم ، یەکەمجـارە ئەو وەڕەقەیە بەر دەســتم بکەوێـت ، بەرکەوتنـی دەســتم بەو وەڕەقەیە هەســت دەکەم بە جۆریـك جەســتەم جـــۆش دەدات و دەوروژێنیـــت وەك ئـــازارم بـــدات وایە ، لە جێگەیەکەوە دیت و سـەردەکەویت بەرە و سنگم و پاشـان نـاو دەمم پر دەکات لە شـیرینی و گەرمیەك بە ناو دەمـم و قـورگم و جەستەمدا هات .
ئـاوی نـاو دەمـم قوتـدا و لەبەردەم چیشـتخانەیەکدا وەسـتام مریشــك کرابــوو بە شیشــەوە و چــاوم لەگەڵ شیشــەکاندا دەســـورا . میـــزیکم لە روکـــاری خـــۆرەکەوە هەڵبـــژاردوو مریشـــکیکی ســـورەوە کـــراوی قەڵەویشـــم هەڵبـــژاردوو بە هێمنی و لەسـەرخۆ دەستمکرد بە خواردن ، زۆر بە هێمنـی و کەمێک خواردنەکەم لە دەممدا دەهێشتەوە تاکو تـام و چێـژی تەواوی لێ وەرگرم , پاشان قوتم دەدا ، ئەو تام و چێـژەی لەو خـواردنە وەرمگـرت لە تـام و چێـژی ئەو شـیرینیەی دەکـرد کە منداڵان دەیکـرن و دەمیـانی لـێ پـر دەکەن وەك تـام و چێـژی ئەو حەڵـــوایە وابـــوو کە بەیەکەمـــین قـــرش کە لە بـــاوکمم وەرگرتبوو کریم . یەکەمینجار نەبوو حەڵوا بکـرم چـونکە پێشـتر دایکـم بـۆی کریبـووم ، بەڵام ئەوە یەکەمـین حەڵـوا بـوو کە خـودی خـۆم بیکـرم ، بە پـارەی خـۆم ، لە نێـوان چەنـدین لە شیرینی و حەڵوای تر هەڵیبژێرم .
شـاگرد چیشـتخانەکە لەبەردەمـم داموکـایەوە و خـواردنەکەی خستە بەردەمم ، دەستەکانی بە قاپێ پر لە خـواردنەوە درێـژ دەکردوو دایدەنا بێـئەوەی سـەرنجی خـواردن و سـەر میـزەکە بـــدات . ســـەرنج نەدانـــی ئەو بـــۆ قـــاپەکەی بەردەمـــم و

خواردنەکـــان ، ئەو پەردەیەی ســـەرچاومی پســـاند ، بـــۆ یەکەمینجارە لە قاپێکدا خواردن بخۆم دوو چاو لێی نەروانیـت ، لەو ڕۆژەوەی لەدایــك بــووم هەمیشـــە دوو چــاو ســـەرنجی خواردنەکە و قاپەکەی بەردەممی دەدا کاتێـک دادەنیشـتم بـۆ نانخواردن .
ئایا کاغەزیکی پـارە دەتوانیـت ئەم هەمـووە بکـات ؟ ئایـا چـۆن پێشتر من نەمزانیوە ، دواتر زانیم کە مـن پێشـتر زانیـومە پـارە چـــیە لەو ڕۆژەوەی چـــاوم بە ژیـــان هەڵهێنـــاوە ، کاتێـــک بـــۆ یەکەمینجــار بــاوکمم بەدیکــرد دەســـت و پەنجەکــانی تونــد نوقانــدبوو شـــتێکی ســـپیێ لە نــاو مشـــتیدا بـــوو بە پەنـــجە زبرەکانی سەرنجی سەر رووە لوسەکەی دەدا .
من هێشـتا لەبەر پەنـجەرەکە لەبەر خـۆرەکەدا دانیشـتبووم و پارە کـاغەزەکەش لە نـاو جانتاکەمـدا بـوو پـارەی خـواردنەکەم نەدابوو .
جانتاکەم کردەوە تا پارە بدەم ، لەو کـاتەدا شـاگردەکە هـات و بە رەوشـتێکی زۆرەوە قاپە بەتاڵەکانی بەردەممی کـۆ کـردەوە ، ســەر میـزەکەی کـۆ کـردەوە بێـئەوەی ســەرنجی جانتـاکە و پارەکە بدات وا هەستمکرد ئەو جووڵەیەی چاوی کاتێک ســەر میزەکەی کۆ دەکردەوە پێشتر بەدیم کردبوو ، چـاو تروکانـدن و لە ژێرەوە سەیرکردنی دەستمی ، چـاو تروکانـدن و لە ژێـرەوە سەرنجدانی شێخ محمودی بیر هێنامەوە کاتێک نوێژی دەکرد چـۆن بە تـیلەی چـاو ســەرنجی قـاپەکەی بەردەممـی دەدا ، چاو تروکاندن و لە ژێرەوە ســەرنجدانی مـاممی بیـر هێنـامەوە کاتێـــک کتێبـــی دەخوێنـــدەوە و لە ژێـــرەوە بە دەســـتی بـــۆ قاچەکانم دەگەڕا .

هەمـان چـاو و هەمـان سـەرنجدانی شـاگردەکە بە چـاویکی سـەرقاڵی کـۆ کـردنەوەی سـەر میـزەکە بـوو بە چـاوەکەی تریشـی سـەرنجی پـارەکەی نـاو دەسـتمی دەدا ، هێشـتا شـاگردەکە وەسـتابوو منـیش پـارەکەم لە دەسـتدا بـوو وەك ئەوەی پـاش ئەوەی چێـژی سێکسـی حەرام کرابێـت ؟ وابـوو خەریك بوو لێی بپرسـم کی حەرامی کردووە ؟ بەڵام لێوەکـانم جووت کردەوە وەك ئەوەی پێشتر ئەو وەڵامەم زانیبیت .
لەو کـاتەوەی دەسـتم بـرد بـۆ قرشـیکی بـاوکم لێـی وەرگـرم کەچی لێیدام ، یـا کاتێـک دایکـم لێـی دام پـاش ئەوەی لەنـاو بازار قرشیکم ونکرد ، کاتێک مـامم قرشـیکی دامـی و وتـی : بە دایکت مەڵی ، کاتێـک ئـامۆژنم قرشـەکانی دەبـژاردوو هەر کە گوێی لە دەنگـی مـن بـوایە حەشـاری دەدانە سـنگیەوە ، یـان کە شـەریفە جونەیهەکـانی دەبـژاردوو هەر لەگەڵ منـی دەبینی دەیشاردنەوە .
وام لێهات هەر کاتێک بمبینیایە کەسێک پـارەیەکی دەربهێنـایە یا بیبژاردایە خێرا چاوەکـانم لـێ دوور دەخسـتەوە و سـەرنجم نەدەدا وەك ئەوەی کە پـارە وەك کۆئەنـدامیکی سێکسـی بینینـی قەدەغە بیـت تەنهـا لە مـن و ریـگە پێـدراو بیـت بـۆ خەڵکانی دیکە .
خەریکبوو بپرسـم کی حەرامی کردووە ؟ بەڵام بیدەنگ بووم و کـریکەیم پێـداو سـەریکی لەقانـدوو دەسـتی درێـژ کـرد بەڵام چاوەکانی هەر دوور بـوو لە سـەرنجدانم . منـیش چیتـر چـاوم دوور نەدەخسـتەوە و سەریشـم دانەدەخسـت ، وام لێهـاتبوو کە بە شـەقامەکاندا تیـدەپەریم سـەرم بەرز دەکـردەوە و بە چـاویکی تیـژ و ڕاسـتەوخۆ لە خەڵکـیم دەروانـی کـاتێکیش

کەسێک پارەیەکی ببژاردایە چاوم لا نەدەدا و سـەرنجم دەدا ، دەرۆیشتم و تیشکی خۆر لە دواوە پشـتمی سـوور کردبـوەوە چێـژی ئەو خـواردنە گەرم و خۆشـەش لە گەدە و جەسـتەمدا لە هاتن و چوندا بوو بـاقی کـاغەزە ( 10 ) جـونەیهیەکەش لە گیرفانمدا بوو بە پێم پێڵاوەکانم لە شەقام و شۆسـتەکان گیـر دەکرد بە سەر بەرزی و نازیکەوە هەنگـاوم دەنـا وەك منـداڵیك چۆن یاریەك دەشکینیت و گری کویرەی چۆنیەتی دەستکردی لا ئاشکرا دەبیت .

پیاوێک لێم نزیـك بـوەوە و چرپانـدی بە گوێچکەمـدا ، بێـئەوەی سڵی لیّ بکەمەوە سەیریکم کردوو وتم : نەخیر . پیاوێکی تر لێم نزیـك بـوەوە و هەمـان نهینـی بە گوێمـدا چرپانـد بە چـاوم سـەرنجیکی تیرمـدا و وتـم : نەخیـر . وتـی : بـۆچی ؟ وتـم : لەبەرئەوەی پیاوانی تر زۆرن منیش یەکێکیان لیّ هەڵـدەبژێرم ، ئەنجا وتی : ئەی بۆچی من هەڵنابژێریت ؟

منـیش پـێم وت : لەبەرئەوەی نینۆکەکانـت رەشـن و منـیش حەزم لە نینـۆکی سـپێە . پیـاوێکی تـر بە هەمـان شـێوە لـێم نزیك بوەوە ، وتم : چەند دەدەیت ؟ وتی : ( 10 ) وتم : نەخیر ( 20 ) وتی : فەرمایشتە پارەکەیدامی .

چەنـد بەسـەر تەمەنمـدا تیپەریـوە بەر لەوەی بـبمە خـاوەنی خۆم و جەستەم ؟ چەنـد لە تەمەن تیپەریـوە بەر لەوەی خـۆم و جەسـتەم تونـد بـکەمەوە لە دەسـت و چنگـی خەڵکـی؟ خواردنم خۆم هەڵیبژێرم و بەخۆشـی خـۆم و چـیم بویـت ئەوە بخۆم ، ئەو خانوە هەڵبژێرم و دیـاری بـکەم کە تیایـدا دەژیـم و خۆم ئەو پیاوانە رەتبکەمەوە کە قینم لێیـان بـوو و هاوکـات ئەو پیاوانە دیاری بکەم کە رەوشت و جەستەیان خاوینە .

چـارەکە سـەدەیەك بەسـەر تەمەنمـدا تیپەریـوە ، لە ( 25 ) ساڵیدا بووم بوومە خاوەنی خـانویەکی پـاك و خـاوین لەسـەر شـەقامیکی خـاوین و کەسـێک خـواردنم بـۆ ئامـادە دەکـات و یەکێکـی تـر کاتەکـانی کـار کردنمـی بـۆ ئامـادە دەکـردم ، بەو مەرجـانەی خـۆم دایـدەنیم ، پـارەیەکی باشیشـم هەبـوو لە بانکدا ، وام لێهـاتبوو کـاتی بەتـاڵم هەبـوو بـوارم هەبـوو تیایـدا بحەویمەوە و سەیری سینەما و شانۆ و خوێنـدنەوەی گۆڤـار و ڕۆژنامەکان و وتویژکردن سـەبارەت بە سیاسـەت بـکەم لەگەڵ چەند هاورییەکی کەمینەمدا کە حەزیان بە هاورییەتیم دەکـرد .
یەکێک لە هاوریکانم ناوی ( ضیاء ) بوو ڕۆژنامەنووس ، نوسـەر شـتێک بوو لەو بابەتە ، من زیاد لە هاوریکانی ترم گـرنگیم بەو دەدا لەبەرئەوەی رۆشـنبیر بـوو ، منـیش رۆشـنبیرم خۆشـدەویسـت لەو ڕۆژەوەی چوبـوومە قوتابخـانە و خوێنـدنەوە فیـر ببـووم ، لەو ڕۆژەوەی توانـای کرینـی کتێـبم هەبـوو و لە مـاڵەوە کتێبخـانەیەکی گەورەم هەبـوو کـاتە بەتاڵەکـانم تیـادا بەسـەر دەبرد و لەسـەر دیوارەکـانیش چەنـدین وینـە و تـابلۆی هونەریم هەڵواسیبوو لە نێوانیانـدا لە چـوار چیـوەیەکی دیـار و گرانبەهادا بروانـامەی دەرچـوونم لە ناوەنـدی ، چـاوم بە هـیچ کەس نەدەکەوت لە ژووری کتێبخانەکەم ، چـونکە تـایبەت بـوو بەخۆم ، ژووری نوسـتنەکەم هۆڵی چاوپێکەوتن بوو ، کاتێک بۆ یەکەمجـار ( ضـیاء ) هـاتە مـاڵەکەم و پێشـوازیم لێکـرد ، پـێش ئەوەی سـەرچەفی جـێگەی نوسـتنەکە هەڵـدەمەوە لەو کـاتەی رووم لە جـێگەکە بـوو لە هـۆڵەکەی ماڵەوە ، گوێم لێ بوو لە دوامەوە وتی : کەمێـک راوەسـتە بـا

تۆزیـك قسـه بکەیـن حەز دەکەم پـێش هەمـوو شـتێک قسـە بکەیـن ، کاتێـک ئەم قسـەیەی کـرد لەریـنەوەی دەنگـی زۆر سەیر بوو لام ، جاران کاتێک لەگەڵ پیاوێکدا جووت دەبـووم کە دەستی پێ دەکرد قسەی لەو جۆرەی دەکـرد بەڵام مـن هەر کە دەستی پێ دەکرد چاوم دەنوقاند تـا ئەو کـاتەی قورسـی لەسـەر جەسـتەم لا دەچـوو ئەو پیـاوە لە جەسـتەم دوور دەکەوتەوە ، بەڵام بەم قسـەیەی ( ضـیاء ) چـاوم نەنوقانـدوو ئاورمـدایەوە دواوە بینـیم دەم و چـاوی وەك دەنگـی گـۆڕاوە ، هەسـتمکرد جەسـتەی لە چـاو خۆیـدا زۆر گەورەتـرە ، دەم و چـاوی پـانترە لە قەبـارەی ئاسـایی و قژیکـی کەم بە سەریەوەیەتی و ناوچەوانی پانە تا دەگـاتەوە سـەر لـوتی دوو چاوی گەورەی رەش و پێستێکی گەنم رەنگی.

( ضـیاء ) وا هەسـتێکرد گـوێم لە قسـەکەی نەبـووە ، دووبـارە وتیەوە با کەمێک پێکەوە قسە بکەین پێش هەموو شتێک وتـم : بەڵام تۆش وەك پیاوان پارە دەدەیت ؟

کات لای من دیاریکراوە و هەر چرکەیەك نرخـی خـۆی هەیە .

وتی : دەڵیی لە کلینکی پزیشکیم !

بە شـێوەیەکی گاڵتەجاریـانە وتـی : ئەی بـۆچی لە هـۆڵی چـاوەروانی لیسـتێک بە نرخەکـان هەڵناواسـیت ، وە ئایـا پشکنینی خێرات لایە ؟! هۆی گاڵتەجاریەکەی تینەگەیشتم ، پـێم وت : گاڵتەجـاری بە کـارەکەی مـن دەکەیـت یـا بە کـاری پزیشـکایەتی ؟ وتـی : بە هەردوکیـان پـێم وت : ئایـا هەردوو کارەکە وەك یەك وان ؟ وتی : بەڵێ ، ئەوەندە نەبێـت پزیشـك کارەکەی ئەنجام دەدات و هەسـت بە ریـز دەکـات وتـم : ئەی من ؟! وتی: تۆ بەریز نیت .

پـێش ئەوەی وشــەی بەریـز نیـت بگـاتە گوێچکەکـانم دەســتم بەرز کردەوە گوێمگرت ، بەڵام وشـەکە وەك تیـر دەربـاز بـوو بـۆ ناو میشـکم ، پاشـان کە لێوەکانی جووت کـرد بیـدەنگی بـاڵی کێشــا بەســەر هــۆڵەکەدا ، بەڵام وشـــەکە لە نــاوەوە هەر زرنـگەی دەهـات ، هەسـتم دەکـرد وشـەکە وەك چەقـۆیەکی تیژ گوێچکەمی دریوە و سـەرمی تەقاندووە تا گەیشـتۆتە مـۆخ .

دەسـتەکانم هەر لە گوێمدا بوون ، دەنگەکەش هەر لە نـاوەوە بــوو لێــی دەدایەوە وەك زەنــگ ، کاتێــک وشـــەکەی درکانــد لێوەکـانی جـووڵەی نەبـوو وەك ئەوەی وشــەکە لە لێوەکـانی کەوتبیتە خوارەوە و بە هەوادا هاتبیت تا گوێچکەم .

لێوەکـانی هێنـایە پێشــەوە بۆســەر لێـوم بەڵام وشــەکە هەر دەزرنگایەوە لە خـۆمم دوور خسـتەوە و وتـم : کـارەکەم بەریـز نیە ئەی بۆ لەگەڵم دەیکەیـت ؟ ویسـتی بەهێـز رامکیشـێت ، بەڵام نەمهیشـت و دەرگاکەم بۆ کردەوە تاکو بچیتە دەرەوە .

( ضــیاء ) لە مــاڵەکەم چــووە دەرەوە بەڵام ئەو وشــەیەی لە گـوێم نەچـووە دەرەوە ، چـونکە چـووە میشـکمەوە و پێشـتر و هـیچ هێزیـك نـیە بتوانێـت سـاتێکی رابـردوو بگیـریتەوە دواوە .

میشـکم پـێش ئەو سـاتە هـێمن و ئـارام بـوو شـەوانە کاتێـک دەمخسـتە سـەر سـەرینەکە ، بە خەویکـی قـوڵ تـا بەیـانی دەنوسـتم ، بەڵام ئێسـتا میشـکم جـووڵەیەکی هەمیشـەیی تیادایە شـەو و ڕۆژ شـەپۆل دەدات وەك شـەپۆلی کەنـار دەریـا ، لە هەڵچـوون و داچوونـدا وەك ئەوەی ئـاوەکە بکوڵیـت دەنگـی پێادا کێشانی شەپۆلی دەریـا لە سـەرینەکەوە بـۆ نـاو گـوێم و لە گـوێمەوە بـۆ سـەر سـەرینەکە ، وام لێهـات دەنگـی ئـاو و

هەوام بـۆ لێـك جیـا نەدەكـرایەوە ، هەموویـان لێـدانی یەك لە دوای یەكن ، وەك لێدانی دڵ لەناو سـنگدا ، وەك چەكوشـیك بەسـەرمدا دەدات بە وشـەیەك ( تـۆ بەریـز نیـت ) ، لە ژووری خــواردن لەســەر سیســەم ، لەژێــر ئیســكەوە لەســەر و ئیســكەوە ، لە شــەقام ئەو تەقەیەی دەدا بەســەرمدا ، لە هەموو جێگەیەكی ئەم جیهانەدا ، دەیـدا بەسـەرمدا و بە دەم و چاومدا , هەستم دەكرد بەركەوتنیكی لینـجە لەسـەر دەم و چــاوم وەك ( تــف ) ، وەك وشــەیەكی ناشــرین لەســەر گوێچكەم ساردوو لینجە ، وەك تیبرینـی چـاوی خـراپ لەسـەر جەســتەی رووتــم ســارد و لیــنج ، وەك دركانــدنی هەمــوو وشـەیەكی ناشـرین لەسـەر گـوێم ، وەك هەمـوو چـاویكی تیـژ كە رووتــم دەكــاتەوە و لــێم ناتروكیــت ، تەنــانەت وەك ئەو تێروانینانەی لەسـەرەوە بە روكەش پـرن لە رەوشـت و ئـارامی بەڵام لە ژێرەوە چاوی تیژی ناپاكی و قینە .
تەنهـا یەك وشــە تیشــكی خســتە ســەر ژیـانم ، منـیش لە بەرگــی ڕاســتەقینەیدا بینــیم ، ئەو پەردەیەی وەك تارمـاییەك بەری چـاومی تەنیبـوو پسـا ، وەك ئەوەی بـۆ یەكەمجـار بیـت چاو هەڵبهینم و ژیان بەدی بكەم ، ئەزانم كە من بەریـز نـیم . پێشــتر نەمــدەزانی ، نەزانــین باشــتر بــوو . نــانم دەخــواردوو دەنوستم خەویكی قوڵ ، ئایا هـیچ شـتێک هەیە بتوانێـت ئەم زانیــاریە لە میشــكم دەربهینیــت ؟ ئەو شــتە تەنهــا وەك ئازاریكی تیژ وایە وەك چەقۆ میشك ببریت .
چەقــۆش نــیە ، تەنهــا یەك وشــە بــوو ، وەك تیــر چــووە میشـكمەوە پـێش ئەوەی گـوێم بە دەسـت بگـرم ، ئایـا هـیچ شـتێكی وا هەیە ئەم وشـەیە لە میشـكم دەربهینیـت ، وەك

چـۆن گـوللەیەك یـان برینیـك لە مـۆخ و جەسـتە دەكـریتەوە و دەردەهینریت ؟!
هیچ شتێک نیە لە جیهاندا بتوانێت بمگیریتەوە بۆ کـاتی پـێش بیستنی ئەم وشـەیە ، بەڵام من لەو سـاتەوە ( مـن ) نەبـووم ، بوبووم بە ئافرەتێکی تر ، ژیـانی رابـردووم کەوتە پشـتمەوە ، نامەویـت بـۆی بگەڕێـمەوە هەرچەنـد گۆشـە گیـر و زەحـمەت بکیشـم و برسـی و رووت بـم ، دەبـمە ئـافرەتێکی ( بەریـز ) بەهەر نرخیـك بیـت ، تەنـانەت گەر ژیانیشـم بەهـای بیـت ، هەمـوو شـتێک دەکەم لە پێنـاو کۆتـایی هێنـان بە بیسـتنی وشـەی ناشرین و کۆتایی هێنـان بە چـاو تیبرینـی خەڵکـی بـۆ جەستەم .
تـا ئەو کـاتەش بروانـامەی قوتابخـانەم هەر مـابوو لەگەڵ بەڵگەی سـەرکەوتن و یەکەمی لە قوتابخانە ، هاوکات خـاوەن میشـکیکی پتەوی سوور بوو لەسـەر کردنـی کـاریکی بەریـز ، هەر وەك خـاوەنی دوو چـاوی گەورەی رەشـی تیـژم لەبەردەمیدا هەموو سـەرنجەکان تێـک دەچـن , دەشـکینەوە ، هەر ئاگـاداریەکم بەدی کردبیـت بـۆ هەر کاریـك چـووم و داواکـاریم پێشـکەش کـردووە ، وەزارەت و کـارگە و کۆمپانیـا و نوسـینگە نەمـا نەچـووبم دواجـار کـاریکی سـکرتاریەتیم گـرتە دەست لە یەکێک لە کۆمپانیا پێشـەسازیە گەورەکاندا .
نوسـینگەیەکی بچـوکم هەبـوو دەرگـایەکی بچـووك لە ژووری سـەرۆکی کۆمپانیـا جیـای دەکـردەوە لە سـەر و ئەم دەرگایەشـەوە گڵـۆپێکی سـوور هەبـوو لەگەڵ زەنگیـك و هەر کاتێک زەنگـی لـێ بـدایە بە دەسـتێک دەرگـاکەم دەکـردەوە و دەچـوومە ژوورەوە بـۆ نوسـینگەی سـەرۆکی کۆمپانیـا ،

ســـەرۆکی کۆمپانیـــا پیـــاوێکی بە تەمەنـــی ( 55 ) ســـاڵی تیپەرانـــدبوو ، کـــورتە بـــاڵا ، قەڵەو ، ســـەری روتـــابوەوە ، بە درێژایـــی ڕۆژ جـــگەرەی دەکێشـــا ددانەکـــانی هەنـــدێکیان کەوتبـــوون و ئەوەشـــــی مـــابوەوە تـــویژیکی زەرد و رەش دایپۆشـیبوو سـەریکی لەسـەر کاغەزەکـانی بەردەمـی بەرز کـردەوە و جـگەرەکەی بە دەمەوە بـوو پێـی وتـم : نامەویـت چاوم بە هیچ کەسێک بکەوێت جگە لە کەسایەتیە گەورەکـان نەبێت ئەمرۆ تیگەیشتیت ؟ بەر لەوەی وەڵامـی بـدەمەوە ئەو کەسایەتیە گەورانە کین سـەری دادەخسـتەوە بۆسـەر میـز و کاغەزەکان و لە دەریایەك لە دوکەڵدا ون دەبوو .

پاش کۆتایی هاتنی کار جانتـا بچکـۆلانەکەم هەڵـدەگرتوو بەرە و ماڵەوە بەری دەکەوتم ، مـاڵەکەم لە مـاڵ نەدەچـوو ، بەڵکـو ژووریکـی بچکـۆلانەی بـی ( تواليـت ) بـوو لە ئـافرەتێکی پێـرم گرتبوو بەکری هەموو بەیانیەك زوو لە خەو هەڵدەسا تا نـوێژی بەیـــانی بکـــات پاشـــان لەبەر دەرگـــای ژوورەکەی منـــدا دادەنیشت ، کاتی چـوونم بـۆ کۆمپانیـا بەیانیـان کـاتژمێر ( 8 ) بوو بەڵام من لە کـاتژمێر ( 5 ) ی بەیـانی لە خەو هەڵدەسـام و بە خاولیەکەوە دەچوومە خوارەوە بۆ وەستان و نۆرە گرتن بـۆ دەســـت و دەم و چـــاو شـــۆرین و ( تواليـــت ) ، ئەو مـــووچە کەمەی لە کۆمپانیا وەرم دەگرت هەر بەشـی کریـی ژووریکـی وا دەکـات لە کـۆلانیکی قەرەبـاڵخی پـر لە دوکـانی فیـتەری و تەنەکەچیتـی ، پێویســت بـوو بەیانیـان و لەکـاتی هـاتنەوەم چەنـدین لە گەڕەکـی بچـووك ببـرم تـا دەگەیشـتمە ویستگەی وەستانی پاسەکان .

پـاش ئەوەی کە پاســەکەش دەهـات هێنــدە قەرەبـاڵخ بــوو جەســتەی پیـاو و ئـافرەتی تیـادا ترنجـا بـوو بەســەر یەکـدا ، لەگەڵ ئەو پیـــاو و ئافرەتـــانەدا پـــاش پاڵەپەســـتۆیەکی زۆر سواری یەکێک لەو پاسانە دەبـووم ، کـاتێکیش سـەردەکەوتم دەتـوت چـومەتە نـاو تەنـوریکەوە  تیایـدا جەسـتەی هەمـووان بەسـەر یەکدا تواونەتەوە و بوونەتە یەك پارچە .

کۆمپانیاکەش دوو دەرگای هەبوو ، دەرگایەکیان بەبـێ چـاودیر و پاسـەوان گەورە کار بەدەسـتان و فەرمانبەرانی لێـوە دەچـووە ژوورەوە ، دەرگاکەی تریش پاسـەوانیك وەك فەرمانبەر لەسـەر کورســی و میزیــك دەفتەریکــی تۆمــاری هــاتن و چــوونی لە بەردەمـدا بـوو ئەو دەرگـایە تـایبەت بـوو بە هـاتن و چـوونی ســـەرجەم فەرمـــانبەرانی تـــری ئاســـایی ، کاتێـــک کە دەگەیشـتمە کۆمپانیا لەو دەفتەرەدا دەگەڕام نـاوەکەی خـۆمم دەدۆزیەوە و ئیمــزام دەکــرد ئەو فەرمــانبەرەش ســەیریکی کاتژمێرەکەی دەسـتی دەکـردوو بەرامـبەر نـاوەکەم کـاتەکەی دەنووسـی و کاتی جێهێشـتنی کۆمپانیـاش دووبـارە کـاتەکەی بە کاتژمێر و چرکە دەنووسـی .

گەورە کـار بەدەسـتان و فەرمـانبەران هەر کاتێـک بیانویسـتایە دەهـاتن و دەچـوون ، هەر یەکەشـیان خـاوەنی ئوتـومبیلێکی گەورە یـان بچـووك بـوون ، جارێکیـان یەکێـک لەو فەرمـانبەرە گەورانە بینیمـی کاتێـک لە یەکێـک لە پاســە قەرەباڵخەکانـدا لەســەر یەك پــێ وەســتابووم لەبەر بــی جێگەیــی جــاریکی تریش فەرمانبەریکی تـری لەو جـۆرە بینینـی کە رامـدەکرد بە دوای پاســیکدا بە شــێوەیەکی وا ســەرنجی هەر لە تەوقە سـەرمیەوە تا بەری پێمی دابوو وەك ئـاویکی سـارد بکریـت بە

جەستەمدا وابوو ، فەرمـانبەریکی پـایە بەرزی بەو شـێوەیە لە فەرمانبەریکی وەك مـن بروانیـت ، قاچەکـانم تـێکەڵ و پـێکەڵ بوو لە تاوان ڕاوەسـتام ، بە ئوتـومبیلەکەی لـێم نزیـك بـوەوە و وتـی : ئەتـوانم بـتگەیەنم ؟ سـەرنجیکی دەم و چاویمـدا و لە دڵی خۆمدا وتم : ئێستا دەڵێت تۆ فەرمانبەریکی هەژاری بـی ریزیـت ئەو لەش و لارە مێینەیـیەت سـەرنجی راکێشـاوم و فەرمانبەریکی بەریز و بەرزی وەك من ئارەزووت دەکات .. کـی دەزانیت لەوانەیە پاشـە ڕۆژ هاوکاریت بـکەم دەستخۆشـیەك و پێشخستنیك لە پێش هاوریکانتەوە وەربگریت لە کارەکەتتدا .

کاتێـک لەبەردەمیـدا بەبـێ دەنگـی مـابوومەوە سـەرنجم دەدا وایزانی گوێم لێی نەبووە ، دووبارە وتی : ئەتـوانم بـتگەیەنم ؟ منیش بەبێ دەنگی وتم : بەهای جەستەم لە پێشخسـتنیك بەنرختـرە ، چاوەکـانی گەشـتر بـوو و بەسـەر سـورمانیکەوە ئوتومبیلەکەی لێخوری و جێی هیشتم لای سەیر بوو چـۆن وا خێرا لە نیەت و خۆزگەی گەیشتم .

لە پاش کارکردنم لەو کۆمپانیـایە بۆمـاوەی ( 3 ) سـاڵ تـوانیم بـگەمە ئەو ئەنجـامەی کە مـن لەسـەرجەم فەرمـانبەرانی تـر ریزم زیاترە و گرنگترم لەگەڵ ئەوەی بەد رەوشتم .

لە خانویەکدا دەژیام ( تواليت ) ی تایبەتی خۆی تیـدا بـوو هەر کاتێـــک بمویســـتایە دەچـــوومە ژوورەوە و لە دەرەوە کەس چـاوەروانی نەدەکـردم و پەلەی لـێ نەدەکـردم ، هەروەهـا جەستەشـم پـاڵە پەسـتۆی نەدەکەوتە سـەر لە نـاو پـاس و ئوتـومبیلە قەرەباڵخەکانـدا بە جۆریـك کۆئەنـدامی سێکسـی پیاوان بە لێشاو بەر جەستەت دەکەوت لە دواوە و لە پێشـەوە ، بەهـــای جەســـتەم هەرزان نەبـــوو ئیجگـــار کە بـــری

پێشخستنیك لە كاردا یان پێاسە كردنیك لەسەر شەقامی نیل بە ئوتومبیل یان نانخواردنیك لە جیگایەك یاخود بۆ قایلكردنی بەریوەبەر یا دامركاندنەوەی تورەیی سەرۆكی كۆمپانیا .
ئەو ( 3 ) ساڵەم لەو كۆمپانیایە بەسەر برد بێئەوەی بەریوەبەریك یان فەرمانبەریك دەستم بۆ بەریت ، حەزم نەدەكرد جەستەم هەرزان فرۆش بكەم پاش ئەوەی فیری نرخی بەرز بووم ، هەموو بانگهێشت كردنیك بۆ نانخواردن و پێاسەی سەر شەقامی نیلم رەت دەكردەوە ، یەكڕاست لە پاش هاتنەوەم لە كۆمپانیا دەنوستم لە پاش ماندوو بوونیكی زۆری كار كردن ، هەروەك بەزەییەكی زۆر دەهاتەوە بەو هاورییانەم كە جەستەی خۆیان هەرزان فرۆش دەكەن بەرامبەر بە نانخواردنیك یاخود نەگواستنەوەیان لە دژی یەكێكی تر بۆ جێگەیەكی دوورتر لە كارەكانیاندا یا بەرامبەر بە راپۆرتێكی ساڵانە ، زۆرجار بەریوەبەران داوای چوون بۆ نانخواردنیكی وایان لێ دەكردم ، بەڵام من بەبێ دەنگی لەسەرخۆ پێم دەوتن : كە من لە هاوریكانم بەرەوشتتر نیم بەڵام نرخم لەوان بەرزترە .
پاشان زانیم فەرمانبەر زیاتر دەترسیت لە لەدەستدانی كارەكەی وە لەوەی بەدرەوشتێک لە ژیانی بترسیت ، چونكە فەرمانبەر ترسی ئەوەی هەیە كارەكەی لەدەست بدات و ببیتە سۆزانی ، لە كاتێكدا نازانیت كە ژیانی بەد رەوشتێک لە ژیانی ئەو بە نرخترە .
فەرمانبەر نرخی ئەم ترسەی ژیانی و تەندروستی و جەستە و بیری دەدات ، بەنرخترین شت لە پێناو بینرخترین شتدا

دەدات . دەشــمزانی کە هەمــووان بەد رەوشــتین بە نرخــی جیاواز ، هەروەك بەد رەوشتی گران لە بەد رەوشـتی هەرزان باشــترە ، هەروەهـا دەمزانــی گەر کـارەکەم لەدەســت بـدەم هەرزانترین شتم لا نامینیت کە سەرە گرتنی بەیانیـانی بەر ( تواليـت )ە کـانە لەگەڵ چـاو تیبرینــی گەورە فەرمـانبەران بـۆ فەرمانبەرانی بچووك و هەژار و بـن دەسـتە ، ئەمە سـەرباری تێــک ترنجانــدنی چــوون بــۆ کــارگەی بەیانیــانی نــاو پاســی ئافرەتــان و پیــاوان ، وام لێهــات مــن هــیچ خەمیکــی کــاری کۆمپانیاکەم نەبوو بە پێچەوانەوە کۆمپانیا خەمـی کـاری منـی بــوو ، هەروەك پەیوەســت نەبــووم بە قـایلکردنی هیچکـام لە گەورە فەرمـانبەران بەڵکـو ئەوان لە نێـوان خۆیانـدا ململانییـان دەکرد لە پێناو قایلکردنم ، پاشـان پروپاگەنـدە لە کۆمپانیـا بـڵاو بــوەوە کە مــن فەرمــانبەریکی بە رەوشـــت و بەریــزم و لە هەمووان ریزم زیـاترە ، بەو پێـیەی کە هـیچ پیاوێـک نەیتوانیـوە تەنـانەت گەورە فەرمـانبەرانیش ملـم پـێ کەچ بـکەن و بەلای خۆیاندا رامکیشـن .

وام لێهات کارەکەمم خۆشـدەویست لەوی چاوم بە هاوریکـانم دەکەوت و قســـەمان بـــۆ یەکتـــری دەکـــرد ، ژوورەکەم و نوسینگەکەم لە ماڵەکەم خۆشـتر و باشـتر بـوو ( تواليـت ) ی تــایبەت بە ژوورەکەشــم خــاوین و قەرەبــاڵخ نەبــوو وەك لای مــاڵەوە کەس پەلەم لــێ ناکــات ، پشــتەوەی کۆمپانیــاکەش باخچەیەکی بچکۆلانەی خۆشـی هەبـوو دەمە و ئێـواران پـێش گەڕانەوەم بـۆ مـاڵەوە تیایـدا دادەنیشـتم ، لەوانەیە گەر شــەو دابیـت هەسـت نەکەم و حەز نەکەم بگەڕێـمەوە بـۆ ئەو ژوورە

داروخاوە و گەڕەکە پێس و پۆخڵە و بۆ ئەو ( تواليت ) و نۆرە گرتنە بۆگەنە .
ڕۆژیکیان دانیشتبووم ، یەکێک لە فەرمانبەرەکان بینیمی سەرەتا ترسا کاتێک لەو تاریکیەدا لاشەیەکی بی جووڵەی بەدیکرد ، لە دوورەوە و پێش ئەوەی نزيك بيتەوە وتی : کییە ؟ کی لەویدا دانیشتووە ؟ بە دەنگێکی خەمبارانەوە وتم : منم . منم فردۆس . لێم نزيك بوەوە ناسیمیەوە ، سەری سورما ، کە من لە باشترین فەرمانبەرانی کۆمپانیام ، فەرمانبەرانی باشی کۆمپانیاش هەر کە کارەکانیان کۆتایی هات دەرۆیشتنەوە .
وتم : کەمێک دەحەویمەوە زۆر هیلاکم ، لەگەڵم دانیشت ، ناوی ( ئیبراهیم ) بوو جەستەی پر و کورت ، قژیکی رەشی ڕەق ، دوو چاوی رەش ، لە تاریکاییەکدا لەبەردەممدا بینیم ، سەیری دەکردم ، دەیبینیم هەرچەند دوور بکەوتمایەتەوە سەرنجی دەدام ، بە دەستم چاوەکانم گرت و دەستم کرد بە گریان ، دەستمی لەسەر دەم و چاوم لاداو وتی: فردۆس ، تکات لێ دەکەم مەگری . پێموت : لێم گەڕی بابگریم . وتی: هەرگیز نەمبینیوە بگریت ، چی رویداوە ؟ وتم : هیچ . هیچ . وتی : نابیت ، شتێک هەر رویداوە . پێموت : هیچ شتێک روینەداوە . بەسەر سورمانیکەوە وتی : بەبێ هۆ دەگریت ؟
وتم : نازانم هۆی چیە ، هیچ شتێکی نویش لە ژیانمدا روینەداوە . بەبێ دەنگی لام مایەوە و دانیشت ، دوو چاوی رەشی یاخی لەو تاریکیەدا پر دەبوون لە فرمیسك و دەستیان بە بریسکە بریسك دەکرد بە لێوەکانی

فرمیسکەکانی دەسری و چاوەکانی وشك دەبوونەوە ، بەڵام ئەمجارەیان فرمیسکیك لە شێوەی دڵۆپەیەکدا لە چاوەکانی هاتە خوارەوە بەسەر لوتیدا خزا ، بە دەستی دەم و چاوی شاردەوە و دەستە سریکی دەرهێنا و فرمیسکەکانی ووشك کردەوە .
پێموت : ئیبراهیم ئەوە دەگریت ؟ وتی : هەرگیز فردۆس . ئەنجا دەستە سرەکەی شاردەوە و خەندەیەکی کردوو خەمباری سەر دەم و چاوی شاردەوە .
لە پشتەوەی کۆمپانیاکە باخچەکە بیدەنگ و بی جووڵە بوو ، شەو تاریکبوو نە خۆر دیارە نە مانگ ، دەم و چاوم بەرامبەر دەم و چاویتی دوو چاوی رەش بە قولێ سەرنجیان دەدام ، وەك بلێی تیشکیکی سحری لێی دەدان و ئەو تیشکە پێچەوانە دەبوەوە بۆ من بێئەوەی هیچ تیشکیکی خۆر و مانگ دیار بیت .
چاوم جێگیر کردە چاوی و دەستم درێژ کردوو دەستیم گرت لەو بەریەك کەوتنەی دەستم بە دەستی وروژانیکی لە میژینە کە لام ئاشکرا ببوو پاشان وون ببوو کەوتە جەستەم و هەستم بە چێژیکی کۆن کرد کە لە تەمەنم دوور و درێژتر بوو ، شتێکم بیرکەوتەوە ویستم بیلێم بەڵام دەنگم گیرا وەك ئەوەی ئەو شتەم بیر چووبیتەوە کە هەر ئەو کات بەیێرم هاتبوەوە ، دڵیشم ترپە و لێدانی زیادی کرد وەك لەوەی لە شتێک بترسم لێم ونبیت ، دەستیم توند گوشی هیچ هێزیك نەبوو دەستی لە دەستم بکاتەوە ، وام لێهات هەر جاریك کە دەمبینی لێوم جوڵەیەکی دەکرد ئەمویست شتێکی پێ بڵێم هەر لەگەڵ بیرکەوتنەوەی ئەو شتەم بیر دەچوەوە .

دڵم لێدانەکانی خێرا دەبوو ، ئەمویست دەستی بگرم ، بەڵام ئەو دەچووە کۆمپانیا و دەهاتە دەرەوە بێئەوەی من ببینیت گەر سەیریشی بکردمایە وەك روانین لە هەر فەرمانبەریکی تری ئاسایی وابوو .
لە کۆبونەوەیەکی فراوانی فەرمانبەران و کریکارانی کۆمپانیادا گوێم لێبوو باسی لە نەهیشتنی جیاوازی لە نێوان کریکارەکان و بەریوەبەرەکاندا دەکرد . چەپڵەیەکی زۆرمان بۆ لێدا و پاشان لەبەر دەرگا ڕاوەستاین تا بیتە دەرەوە و تەوقەی لەگەڵدا بکەین دەستیم گرت و چاوم بریە چاوی ناوەکەی ( ئیبراهیم ) لەسەر پشتی نوسینگە و کتێبخانە و لە ناو لەپیّ دەستمدا دەمنوسی ، کاتێک بە بەردەم باخچەی کۆمپانیادا تیدەپەری و منیش لەوی دەبووم هەڵدەسام وەك ئەوەی بچم بۆلای بەڵام نەدەچووم و دادەنیشتمەوە .
ئەنجا ( فتحیە ) ی هاوریم کاتێک دەیبینیم هەڵدەسم و دادەنیشمەوە لێم نزیك دەبوەوە و بە چرپە پێی دەوتم کە فردۆس چیتە ؟ منیش پێم دەوت : بلێی ئیبراهیم لەبیری کردبیت ؟ لێی دەپرسیم : چی لەبیر کردبیت ؟ منیش پێم دەوت : نازانم فتحیە . ئەویش دەیوت : فردۆس تۆ لە داڵغەدا دەژیت ... منیش دەموت : هەرگیز ، هەرگیز فتحیە ، ئەوە روویدا . لێی ئەپرسیم : چی روویداوە ؟
منیش هەوڵم دەدا پێی بڵێم کە چی روویداوە بەڵام نەمدەزانی چۆن بڵێم ، هیچم پیّ نەبوو پێی بڵێم ، بیرم دەچوەوە وەك ئەوەی هەرگیز هیچ شتێک رووی نەدابیت .
دواتر رەشینەی دوو چاوەکەیم دەهێنایەوە بیر خۆم کە چۆن سەرنجی دەدام و منیش سەرنجم دەدا و رەشینەی چاوی

بە قەبارەی زەوی لێدەهات سپێنەکەی چاویشی پرشنگی دەدایەوە وەك تیشکی خۆر ، بە شێوەیەکی وا چاوم ریشکە و پێشکەی دەکرد هەموو وینەکان لەپێش چاومدا تێکەڵ و پێکەڵ دەبوو دەم و چاوی باوکمم لە دەم و چاوی دایکم بۆ جیا نەدەکرایەوە ، دەم و چاوی وفیە لە فتحیە و ئیقبال لە ئیبراهیم . پاشان لە ترسان چاوم دەکردەوە تا نابینا نەبم ، سنوری دەم و چاوی ( فتحیە ) م دەبینی لە شەوی تاریکدا پێی دەوتم : فردۆس ئیبراهیمت خۆشدەویت ؟ منیش پێم دەوت : هەرگیز فتحیە . ئەویش ئەیوت : ئەی بۆچی هەڵدەلەرزیت هەر کە ناوی دەبیستیت ؟ منیش دەموت : هەرگیز ؟ روینەداوە . تۆ هەروا شت زل دەکەیت . ئەنجا فتحیە ئەیوت : ئیبراهیم پیاوێکی شۆرشگیرە منیش دەموت : بەڵێ ، بەڵام من فەرمانبەریکی بچکۆلانەم ، ئیتر ئایا ئەبیت ئیبراهیم ئافرەتێکی هەژاری وەك منی خۆش بویت ؟

لە پاشان لیژنەیەکی شۆرشگیری بە سەرۆکایەتی ئەو لە کۆمپانیا دامەزرا چوومە لیژنەکەوە و شەو و ڕۆژ کارم دەکرد ، ڕۆژانی پشووش بەبێ کری کارم دەکرد ، هیچ بیریکم لە کری و وەستانیش لە نۆرەی ( توالیت ) نەدەکردەوە و هیچ ئازاریکی نەدەدام هەروەك هیچ قەرەباڵخیەکی ناو پاسەکان و تێک ترنجاندنی جەستەکان نیگەرانیان نەدەکردم .

جاریکیشیان بینیمی بەدوای پاسدا رامدەکرد بە ئوتومبیلەکەی بۆم ڕاوەستا و بانگی کردم . لەگەڵی سوار بووم ، گوێم لێبوو دەیوت : فردۆس من تۆم زۆر بە دڵە . گەر لە کۆمپانیا پێنجی وەك تۆمان هەبیت لە توانا و ورەی تۆ ئەوا ئەمانتوانی هەموو شتێک بکەین لە جیهاندا ، منیش هیچ

وەڵامـێکم نەدایەوە . تونـد جانتـاکەم بە سـنگمەوە نوسـاندبوو تاکو لێدانەکانی دڵـم بشـارمەوە و هەناسـەم ئاسـایی بیـت ، بەڵام هەناســە بــرکیم پــێکەوت و هەرچەنــد دەمزانــی درۆ دەکەم وتم : ئێستاش هەناسەم سـوارە بەهـۆی راکـردنم بە دوای پاســەکەدا ، لەوە دەچــوو بزانیــت کە درۆ دەکەم بەبــێ دەنگــی خەنــدەیەکی کــردوو لێــی پرســیم : ڕاســتەوخۆ دەرۆیــتەوە بــۆ مــاڵەوە یــان حەز دەکەیــت کەمێــک بەیەکەوە دانیشین ؟
پرسیارەکە کتوپڕی بوو بێئەوەی بیـر بـکەمەوە وتـم : نامەویـت بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە.
بەڵام وتــم : ئــاخر تــۆ هیلاکیــت بە هــۆی کــارەوە و پێویســتە بچیتەوە ماڵەوە بحەوییـتەوە . وتـی : لەوانەیە کەمێـک لەگەڵ تــۆدا قســە بــکەم بحەویــمەوە ، گەر تــۆ هــیلاك نەبێــت و پێویستت بە حەوانەوە نەبێت . بێ ئەوەی ئاگـام لەخـۆم بیـت وتم : حەوانەوە ؟ ژیانم هیچ جۆريك لە حەوانەوەی تیادا نیە .
پاشــان هەســتم بە گەرمــی دەســتیکرد کاتێــک دەســتمی گوشـی ، تەزویەك لە بەری پێمەوە گەیشتە تەوقـی سـەرم و جەستەم گوێم لێبـوو وتـی : فـردۆس ، بیـرتە یەکەمینجـار کە بینیمیت ؟ وتم : بەڵێ . وتی : لەو ڕۆژەوە مـن بیـرم هەر لای تۆیە ، وتم : منـیش هەروەهـا وتـی : ویسـتم هەسـتەکانمت لێ بشارمەوە بەڵام نەمتوانی . وتم : منیش هەروەها .
ئەو ڕۆژە لەسـەر هەموو شتێک قسـەمان کرد . منداڵی خۆم و رابردووم بۆ گیـرایەوە ، ئەویـش منـداڵی خـۆیی و خەونەکـانی پاشـە ڕۆژی بۆ دەگیرامەوە . بـۆ ڕۆژی دواتـر باسـی زۆر شـتی ترمان کـرد ، تەنـانەت ئەو هەسـتە شـاراوانەی لام بـوون بـۆم

باســکرد ، ئەویــش هەمــوو شــتێکی بــۆ باســکردم . بــۆ ڕۆژی سێهەم بردمی بـۆ مـاڵە بچکـۆلانەکەی ، شــەوم لەگەڵ بـردە سەر قسەمان بۆ یەکتری دەکرد ، جەستەی دەدا بەســەرمدا و جەســتەم دەدا بەســەریدا وا هەســتم دەکــرد جیهــانم لە مشــتایە ، جیهــان لە بەرچــاوم فــراوان بــوو تیشــکی خــۆر پرشنگی زیاتر بوو ، هەموو شتێک تیشکیکی سەیری هەبـوو ، تەنانەت نۆرە گرتنی ( توالیـت ) ە هـاوبەش و گشـتیەکە لام جوان بوو ، چاوی سەرکەوتوانی پاســەکەش وەك جـاران زەرد و زەق نەبوون بەڵکـو گەش و بریســکەدار بـوو ، لە ئـاوینەکەدا چــاوی خــۆم بینــی گەش و بریســکەدار بــوو جەســتەم وەك پووش سوکەڵە بوو شەو و ڕۆژ کارم دەکرد هەستم بە هـیلاك بوون نەدەکرد و خەویشــم لـێ نەدەکەوت ، ڕۆژیـك یەکێـک لە هاوریکانم لە کۆمپانیـا ســەرنجیدام و بەســەر ســورمانیکەوە و بە هێمنی پێی وتم : فردۆس چی روویـداوە ؟ وتـم : بـۆچی ؟ وتــی : دەم و چــاوت لە دەم و چــاوی جارانــت ناکــات . وتــم : چی ؟ وتی : دەم و چاوت بە شێوەیەکی ســەیر پرشــنگدارە . وتم: کەسێکم خۆشــدەویت . وتـی : خۆشەویســتی ؟ وتـم : ئەیناسیت ؟ بە خەمباریەکەوە وتی: نەخیر . وتم : ئەی دامـاو ! وتــی : ئەی هەڵخەڵەتــاو ! بــروات بە شــتێک هەیە نــاوی خۆشەویســتی بیــت؟ وتــم : خۆشەویســتی منــی کــرد بە مرۆڤیکــی تــر و ، هەر خۆشەویســتی ژیــانی لەبەرچــاوم جوانکرد . بە پەژارەیەکەوە وتی : هەڵخەڵەتاو ! بروا بەو وشـە خۆشەویستیانە ئەکەیت کە بە کەسـانی هەژاری وەك ئـیمە دەوتریت ؟ وتـم : ئەو پیـاوێکی شۆرشـگیرە و لە پێنـاو ئـیمە و ســەرجەم هەژارانــدا دەجەنگیــت . بە خەمبــاریەکەوە وتــی :

ئەی دامــاو بــروا بەو قســانە دەکەیــت کە لە کۆبونەوەکانــدا دەکریت؟
بە تــورەییەوە وتــم : بەســە ! تــۆ چــاویلکەیەکی رەشــت لە چاودایە تیشکی خۆر نابینیت .
لەویـدا مـن دەم و چـاوم لە خـۆرەکە بـوو سـەرنجی تیشـك و گەرمــیم دەدا دایدەپۆشــیم هەر کە دەمبینــی بە بــاخچەی کۆمپانیـــادا تیـــدەپەری کە تیشـــکی خـــۆرەکە لە چاویـــدا بریســـکەیەکی ســـەرنج راکیشـــم بەدیکــرد لە چاویــدا وەك ئەوەی چاوی پیاوێکی تر بیت رامکرد بـۆلای تـا پێشـوازی لـیّ بـــکەم ، بەڵام فەرمـــانبەریکی زۆرم لە دەور و بەری بینـــی تەوقەیــان لەگەڵ دەکــردوو پیــرۆز باییــان لــیّ دەکــرد . لەو قەرەباڵخیەدا منی نەبینی ، چەند دەنگێکم لێرە و لەوی هـاتە بەر گـــویّ کە دەوتـــرا : کچـــی ســـەرۆکی ئەنجـــومەنی بەریــوەبردنی کۆمپانیــای مــارە کــردووە . کــوڕیکی زیــرەکە و قابیلیتی . پاشـە ڕۆژی رووناکە .
بە خێرایی لە کۆمپانیـا سـەر دەکەویت و جـی دەسـتی دیـار دەبیت ، هەردوو دەستم کرد بە گوێمدا تاکو چیتـر ئەو قسـانە نەبیسـتم و لە کۆمپانیــا هــاتمە دەرەوە و نەشــچوومەوە بــۆ ماڵەوە .
بەسـەر شـەقامەکاندا دەرۆیشـتم ، چـاوم هیچـی نەدەبینـی ، فرمیســکەکان بەســەر دەم و چاومــدا دەهــاتنە خــوارەوە و ووشـــك دەبـــوونەوە ، دووبـــارە دەهـــاتنە خـــوارەوە و ووشـــك دەبوونەوە ، شـەو داهات فرمیسـکەکان لەسـەر دەم وچـاوم و گەردنـم ووشـك بوبـوونەوە ، بەڵام هێشـتا سـنگ و بەرۆکـی کراســەکەم هەر تەر بــوو ، هەوای ئەو شــەوە ســاردەش لە

جەستەمی دەدا ، دەستم لە سنگمەوە پێچا تا گەرمیەکم پێ بگات دەست و قوڵی ئەوم بیر کەوتەوە کە تیوەی دەئاڵاندم و جاریکی تر و هێندەی تر هەڵ لەرزینەکەم زیادی کرد ، گریام بەڵام فرمیسکم وشکی کردبوو نەمابوو ، گوێم لە دەنگێکی کز و لاواز بوو زانیم دەنگی خۆمە ...
ئەو شەوە گەڕامەوە بۆ کۆمپانیا ، چوومە ژوورەکەم و کاغەزەکانم کۆ کردەوە و کردمە جانتا بچکۆلانەکەم و بەرە و دەرگای چوونە دەرەوە رۆیشتم . لەو هەواڵەی بەیانیەوە و لەو کاتەوە ئیبراهیمم نەبینی بوو لەنا دەرگاکەدا وەستام بەملاولای خۆمدا روانیم ، باخچەکەم بینی لە پشتەوە چووم کەمێک لێی دانیشتم هەر کاتێک گوێم لە جووڵەیەك یا دەنگێک دەبوو لە دوورەوە بهاتایە شتێک دەهاتە بەر گوێم و دەپەشۆکام ، لەشیکم بینی لە نزیك تارمەی دواوەی کۆمپانیا ، هەستامە سەر پێ سەرم و سنگم و دڵم بە یەکەوە لێی دەدا ، وا هاتە بەرچاوم ئەو لەشەی بینیم بۆ لای من دیت و لێم نزیك دەبیتەوە ، بە هێمنی و لەو تاریکیەدا بەرەو ئەو جێگەیە چووم ، ئاو و عەڕەقیکی زۆر سەر جەستەم کەوتبوو جەستەم و قژم و ناو دەستمی تەر کردبوو ، هەستم بە کەمێک ترس کرد کە بەو تاریکیە بەو تارمەیەدا بە تەنها دەرۆیشتم ، بە دەنگێکی هێمن و لەسەرخۆ بانگم کرد ( ئیبراهیم ! ) هیچ دەنگ و وەڵامێک نەبوو .
ترسەکەم زیادی کرد بەڵام من هێشتا تارماییەك لە تارمەکەدا ئەبینم ، ئەمجارەیان بە دەنگێکی بەرزتر هاوارم کرد : ئەوە کییە ؟ وەك لە خەو رابم تاریکاییەکە کەم بوەوە بینیم دیواریکی شاقوڵی لە تارمەکەدا دروستکراوە بێئەوەی بۆیە

بکریت هەر وەك جەستەی مرۆڤ دیار بوو لە دوورەوە نازانم هێندە نەبووە دروستکراوە یان هەر بووە و من هەستم پێ نەکردووە .

پێش ئەوەی لە دەرگای کۆمپانیاکەش بچمە دەرەوە کەمێک وەستام و بە وردی سەرنجی دەرگا و پەنجەرە و دیوارەکانم دەدا ، بەو هیوایەی یەکێک لە پەنجەرەکان بکرێنەوە و خودا حافیزەم لێ بکات و دەستی ماڵئاوایم بۆ بەرز بکاتەوە . چاوەکانم لە جووڵە نەدەکەوتن و سات لە دوای ساتیش بێ هیوا دەبووم ، بەڵام هەر بێ هیوا نەدەبووم و هەر چاوە چاوەم بوو سنگم بە خێرایی لە هەڵبەز و دابەزدا بوو . پێش ئەوەی بە تەواوی لە دەرگای کۆمپانیا بیمە دەرەوە بۆ سەر شەقامەکە کەمێکی تر وەستام ، کاتێکیش دەستم بە رۆیشتن کرد هەر ئاورم دەدایەوە بۆ دواوە وەك چاوەروانی شتێک بم یاخود لە پڕ شتێک بکریتەوە ، بەڵام سەرجەم دەرگا و پەنجەرەکان بە داخراوی مانەوە .

هەرگیز ئازاری وا بە سویم بە درێژایی ژیانم نەچەشتبوو ، کاتێک سۆزانی بووم ئازارم کەمتر بوو ، ئازاریکی خەیاڵی بوو زیاتر تا ئازاریکی ڕاستەقینە ، کاتێک کە سۆزانی بووم من خودی خۆم نەبووم ، هەستم هەستی من نەبوو ، هیچ شتێک هێندەی ئەم رووداوە ئازاری نەدام ، هێندە هەستم بە نەفرەت لەخۆکردن نەکردبوو وەك لەم رووداوەوە لە خۆم کرد ، دیار بوو ئەوکات کە سۆزانی بووم هێندەم نەفرەت لێکرابوو خۆشم لەخۆمم کردبوو سیوام ببوەوە و هەستم نەدەکرد ، ئیدی لە هیچی تر نە دەترسام ، یاخود لەبەرئەوەی سۆزانی

جـێگەی کۆڵانـانە بـۆیە چـاوەڕوانی هـیچم نەدەکـرد لە دەرەوە لێم رووبدات .
بەڵام لە خۆشەویســـتیدا چـــاوەڕوانی شـــتێک بـــووم . لە خۆشەویسـتیدا خەونـم بەوەوە دەبینـی کە خەریـکە دەبـمە مرۆڤ ، یان لەبەرئەوەی کە سۆزانی بـووم هـیچ شـتێکم بـی بەرامبەر نەدەدا ، هەموو توانـا و کۆششـیکم بـۆ خسـتەگەڕ و خۆم دایە دەستی بی بەرگـری و بـی چەك ، بەڵام کاتێـک کە سـۆزانی بـووم بەردەوام لە حـاڵەتی بەرگـری کـردن بـووم لە خـۆم ، خـۆم دەپاڕاسـت بە کێشـانەوەی هەمـوو هەسـت و خۆشـیەك لە جەسـتەم و جەسـتەیەکی بـی گیـانی بـی هەستم دەدایە پیاوان .
بەو بی هەستیە خۆم دەپاڕاست و بە بەرگـریم لە قەڵەم دەدا ، دەمتوانی بە هەر شـێوەیەك بیـت بە پیـاوان بڵـێم جەسـتەم بەرن بەڵام هەرگیـز نـاتوانن وام لـێ بـکەن هەڵـبچم و چێژیـك تەنانەت ئازاریکم پێ بگەیەنـن . مـن لە نـاو خـودی خـۆم و لە ناخەوە دەنوستم و هەستم بە هیچ نەدەکرد.
تەنـانەت هەسـتم بە هیلاکـیش نەدەکـرد ، لەبەرئەوەی هـیچ هەوڵ و توانایەك بە فیرۆ نادەم . خـۆم بەکـار نـاهینم بەڵکـو لە ناخــدا عەمبــاری دەکەم ، چەنــد ســۆزانی بــووم هەســتم نەکــردووە هــیچ هەوڵ و توانــایەك بە فیــرۆ بــدەم ، بەڵام لە خۆشەویستیدا چەنـدین لە هەوڵ و توانـاو هەسـتی نـاخم لە دەستدا !
من هـیچم نەدەویسـت لەوە زیـاتر کە خۆشـەویسـتی رزگـارم بکات و هەست بە بوونی خۆم بکەم ، ببوومە کەسـێکی دیـار و بەریز خەڵکانی تـر قینیـان لـێم نەبـوو ، بۆشـم نەبـوو ئەوەی

دەمویست باسی بکەم ، هەرچی بکەم من فەرمانبەریکی بچووکی هەژارم ، هەرچەند بدەم لە بەرهەمی پیرۆز ، پیرۆزی من وەك ( پیرۆزی هەر هەژاریك ) ناتوانریت لە چاوی خەڵکیدا ببیتە شتێکی باش و بە پیت . بەڵکو دەبیتە بێ هێزی و گێلی .
وام لێهات زانیم کە دوا دڵۆپێ پیرۆزیم لە خوینمدا لە دەستدا ، وایلێهات میشکم هەستی بە ڕاستیەکان دەکرد و بە ئاگا بووەوە . ڕاستی ئەوەی کە سۆزانی بم باشترە وەك لەوەی پیرۆزیکی هەڵخەڵەتاو بم ، هەموو ئافرەتان هەڵخەڵەتاون . پیاوان هەڵت دەخەڵەتێنن و پاشان سزات دەدەن لەبەرئەوەی هەڵخەڵەتاوی .
پیاوان وات لێ دەکەن لا بدەیت تاکو ئاستی نزم بوونەوە پاشان سزات دەدەن لەبەرئەوەی نزم بویتەوە . پیاوان شوکردنت بەسەردا دەسەپێنن پاشان لیت دەدەن و قسەی ناشرینت پێ دەڵین ، ئەمە سەرباری خزمەتکاری بەردەوام .
ئەوەندە نەبێت ریژەیەکی کەمی ئافرەتان هەڵنەخەڵەتابن کە سۆزانیەکانن ، هەروەك لە پێناو ژیانی هاوسەریتی یاخود خۆشەویستی ئافرەت سزاکەی دوو هێندە دەبیت .
شەو گەیشبووە نیوەی ، شەقامەکەش بیدەنگ ببوو ، شنەی نیلیش سحراوی و دڵفڕێن بوو ، منیش بە تەنها دەرۆیشتم چێژم لە ئارامی و بیدەنگی وەردەگرت و چیتر هەستم بە ئازار نەدەکرد . شنەی ئەو شەماڵە هێمنە لە دەم و چاوی دەدام و منیش چێژم لە چۆڵی ئەم شەقامە و پەنجەرە داخراوەکان وەردەگرت ، چێژم لە غەریبیم لە خەڵکی و بی ئاگایی خەڵکی لە من وەردەگرت غەریبی لە زەوی و

ئاسـمان و دار و درەخـت ، وەك چـۆن کەسـێک بە جیهـانیکی ســــحراویدا تیبپەریـــت کەس نەناســـیت و کەســـیش ئەو نەناســیت هەر شـــتێکت ویســـت دەیکەیـــت و نایکەیـــت . ئـازادییەکی بـی جێگەیـی بـی سـنور و چێـژ جیـابوونەوە لە گەردوون هەســت بە ســەربەخۆیی دەکەیــت و هەســت دەکەیــت بـونەوەریکی ســەربەخۆیە ، پیـاو فەرمـانرەوایەتی ناکـــات و پابەنـــدیش نـــیە بە هیچکـــام لە یاســـاکانی خۆشەویستی و ژیانی هاوسەریتی .

ئەو لە دەرەوەی زەمەن و دەرەوەی یاســـــــــا و دەرەوەی گەردوونە . گەر ئەو پیــاوەی دیــت داوای نەکــات ، بیگومــان ئەوی دوای ئەو داوای دەکـات ، یـان ئەوی دواتـر . چـاوەروانی یەکێکـی دیـاریکراو ناکەیـت ، گەر نەهـات خەمبـار و دڵگـران دەبیـت چـاوەروانی هـیچ شـتێکیش ناکەیـت روبـدات گەر رووشـی نەدا ئـازار دەچێـژی . ئەو بە هیـوای هـیچەوە نـیە و حەزیـش لە هـیچ شـتێکیش ناکـات و لە هـیچ شـتێکیش ناترسیت ، چونکە ئەوەی دەبوو روبدات روویدا ، لەوانەش نـیە هیچ شتێکی زیاتر روبدات لەوی رویداوە .

خۆم بینیەوە ئامیزم کردۆتەوە بۆ ئەو شـەوە سـحراویە و لەبەر خۆمەوە ئەم وشانەم لە شێوەی گۆرانیەکدا بە هێمنـی دەوت بە هیوای هیچ نیم ، حەزم لە هیچ نیە ، لە هیچیش ناترسـم ، چونکە من ئازادم .

لە ناکاو لە بەردەممدا ئوتومبیلیکی درێـژی عەنتـیکە وەسـتا ، پیاوێک سـەری دەرهێنـا پێکەنـیم . لەنـاو جـێگە نەرمەکەشـدا بـی هـیچ هەوڵ و توانـایەك ئەمـدیو و ئەودیـوم دەکـرد بـی ئەوەی هیچ هەسـت بە هـیچ خۆشـیەك یـان ئازاریـك بـکەم ،

لەو کـاتەی لەسـەر جـێگەی نوسـتنەکە ئەمـدیو و ئەودیـوم دەکرد بۆم دەرکەوت کە پیاوانی شۆرشگیر خاوەن بیر و راکـان هیچ جیاوازیەکیان نیە لەگەڵ پیاوانی تردا .

ئەوان بە ژێـری و بیـر و رای خۆیـان ئەو شـتانەیان دەسـت دەکەویـت کە پیـاوانی تـر بە پـارە و پـول و سـامان دەسـتیان دەکەویت . ئەوان شۆرشگیرن ، بەڵێ ، وەك ئیمەی سـۆزانی ، شـۆرش لای ئەوان وەك سێکسـی لای ئـیمە وایە ، شـتێک پێشکەش دەکریت و نەفرەتی لێ دەکریت .

پاشـان ( ئیبـراهیمم ) چـاو پـێکەوت لە پـاش چـوار سـاڵ لە ژیـانی هاوسـەری بەسـەر بـردن ، داوای کردبـوو بیـتە لام ، هێشتا من هەر خۆشم دەویست ، رەتـم کـردەوە . نەمتـوانی خۆم لەگەڵیدا بەراورد بکەم . بەڵام لە پاش چەند یتێکـی تـر و پاش سوربونی لەسەر چاوپێکەوتنم ، چیتـر رەتـم نەکـردەوە ، لەو کاتەی خەریکبوو برواتە دەرەوە لە ماڵەکەم بێـئەوەی هـیچ بدات پێم وت : ( بیرت چوو نـرخەکەی بـدەیت ) . جـزدانەکەی لە گیرفـانی دەرهێنـا و دەسـتی هەڵـدەلەرزی کـاغەزیکی ( 10 ) جـونەیهی دامــی ، منـیش پێـوت : نـرخەکە ( 20 ) جونەیهە کەمی نیە گەر زیاد نەکات بە لەرزە لەرز کـاغەزیکی تری ( 10 ) جونەیهی دامی .

بـۆم دەرکەوت ئەو کاتێـک خۆشـی دەویسـتم کە هەمـوو شـەویك دەهـات بـۆلام و پـارەی نەدەدا ، هێنـدە بە ئاگـا بـووم قیـنم لە پیـاوان دەبـوەوە ، سـاڵانیکی دوور و درێـژ نـاویرم ئەم نهینیە بدرکینم ، لە هەموویـان زیـاتر قیـنم لێـی بـوو ئەو پیـاوە بوو کە پێی دەوتم : ئەیەویت رزگارم بکات لەو حـاڵەی تیایـدام

. قینم لێی بوو لەبەرئەوەی وا هەست دەکات لەمن باشترە و دەتوانیت رزگارم بکات .
بیر لە رزگارکردنم دەکاتەوە بۆ ئەوەی بیانوی رۆڵی پاڵەوانی فریا گوزار بقۆزیتەوە ( ئەو پاڵەوانەی لەو رزگارکردنە شکستی هێنابوو لە رابردوودا ) . رۆڵی لاوچاك و بەتەنگەوە هاتن ئەبینیت . هەست بە لێهاتوویی دەکات هەر کاتێک رەوشت نزمی بە بیر من دەهینیتەوە ، وەك ئەوەی بەخۆی بڵێت : من لێهاتوو و پایە بەرزم ، هەوڵ دەدەم هەڵت بگرمەوە ئەی ئافرەتە سۆزانیەکە .
منیش سەرجەم لێهاتوویی و پاڵەوانیتیەکانیم رەت دەکردەوە ، کەسێک رزگاری نەکردم کاتێک هاوسەر بووم و بە شەق لێم دەدرا ، کەس رزگاری نەکردم کاتێک خۆشەویستی روخاندمی و خەریکبوو لەناوم بەریت . ژیانی ئافرەت لە هەموو دۆخەکاندا خراپە ، ژیانی سۆزانی باشترە . خۆمم وا قایلکرد کە خۆم هەڵم بژاردووە ، رەتکردنەوەی پاڵەوانیتی ئەوان لای منەوە سوربوونم بوو لەسەر ئەوەی کە سۆزانی بم ، بۆم دوپات دەکاتەوە کە خودی خۆم ژیانم هەڵبژاردووە و سەربەستم لە هەڵبژاردنی ئەو شتانەی زیانیان کەمترە .
سۆزانی بەردەوام دەڵێت : ( بەڵێ ) و مەرج دادەنیت لە نرخەکەدا ، کاتێکیش کە سۆزانی بڵێت ( نەخیر ) ئەوە واتای ئەوەیە کە سۆزانی نیە ، وە لەبەرئەوەی کە من سۆزانی نیم ئەوە هەندێکجار دەڵێم ( نەخیر ) ، وشەی ( نەخیر ) وایکرد ڕۆژ بە ڕۆژ نرخم بەرز بیتەوە . پیاو بەرگەی ئەوە ناگریت هەندێک ئافرەت رەتی بکەنەوە چونکە لە ناخەوە رەتکراوەتەوە و هیچ کەسێک ناتوانیت هەردوو رەتکردنەوەکە

وەربگریــت ، هەر ئەوەش بــوو کاتێــک دەمــوت : ( نەخیــر ) پیاوەکە زیاتر ســوور دەبــوو ، هەرچەنــدیش نــرخ بەرز بــکەمەوە هەر ســوور دەبــوو ، هەرگیــز بەرگەی ئەوە ناگریــت ئافرەتێــک رەتیبکاتەوە.
وام لێهات بوومە سـۆزانیەکی سـەرکەوتوو ، بەرز تـرین نـرخم دەســت دەکەوت و گرنگتــرین و بــاڵا تــرین پیــاوان ململانــیم لەســەر دەکەن . ڕۆژیـك لە ڕۆژان پیـاوێکی گرنگـی یەکێـک لە دەوڵەتەکـان ناوبـانگی بیســتبووم بینیمــی داوای کـردم رەتـم کردەوە . من دەمزانی کە زوربەی زۆری ئەم فەرمانرەوایـانە بە ئاســـانی شکســـت نـــاخۆن لەبەردەم خەڵکـــانی تـــردا ، لەبەرئەوەی هەمیشـــە لە نـــاوەوە و لە نـــاخەوە شکســـت خواردوو و دۆراون .
مــرۆڤ ناتوانیــت هەردوو شکســتەکە وەربگریــت ، هەر ئەم هۆیەشــە بە بەردەوامــی بە کوڕســیەکانی فەرمانرەوایەتیــدا سـەردەکەون ، ئەو دەســت بەســەرا گـرتنەی ئەوان هەســتی پێ دەکەن و فەرمانرەوایەتی خەڵکانی تـری پـێ دەکەن هەر ئەوەیە وایــان لێــدەکات هەســـت بـــکەن ســـەرکەوتوون ، سـەرکەوتنیکی لە ناخیانـدا سـاختە ، بەڵام ڕاسـتەقینە لای خەڵکانی ترە و هەر ئەمەشە کە گرنگ بیت .
رەتکـردنەوەم بـۆی زیـاتر ســووری کـرد لەســەر داواکـردنم و سـەرکەوتن بەسـەرمدا . هەمـوو ڕۆژیـك پۆلیسـیکی دەنـارد بە شـوینمدا و منـیش دەرم دەکـرد . لە هەر جاریکیشـدا پیـاوانی پۆلیس هەڵسوکەوتێکی نویم لەگەڵدا بەکار دەهینن .
جاریــك پــارەم پێشــکەش دەکــات ، جاریــك بە بەنــدکردن هەرەشـــەم لـــێ دەکــات ، جاریکیشـــیان پێـــی وتـــم : کە

رەتکـــردنەوەم بـــۆ فەرمـــانرەوایەکی وا وەك نەفرەتکـــردن و هەڵســوکەوتێکی ناشــرین وایە بەرامــبەری بکریــت هەروەك کـاریگەری هەیە لەســەر پەیوەنـدی نێـوان هەردوو دەوڵەت ، من گەر کەسێکی نیشتیمان پەروەر بم ئەوا پێویستە بچـم بـۆ لای ، منـیش بە پۆلیســەکەم وت : کە هـیچ نـازانم لە بـارەی نیشتیمان و هاونیشتیمانی و نیشـتیمان هیچـی نەداومەتـی بەڵکو هەموو شتێکی لی زەوت کردووم تەنانەت ( شــەرەف و ناموسیشـم ) . ئەوەی سەیر بوو سەری سورماو نیگەران بـوو ، کە چــۆن کەســێک هەمــوو هەســتێکی نیشـــتیمانی بەو شێوەیە لە دەست دەدات ؟ ئەنجا پێکەنـیم بە هـۆی جیـاوازی نێـــوان دوو لایەنە و رەوشـــت . ئەوان ســـۆزانیەك دەبەن بـــۆ پیاوێــک . ئەوان گەوادن ، کەچــی لەگەڵ ئەوەشـــدا بــاس لە نیشتیمان و رەوشـت دەکەن بەوپەری ریزەوە .
ئەنجا زانیم کە پیاوانی پۆلیس تەنها فەرمان جیبەجـی دەکەن هەر فەرمـانیکی بـۆ دەربکریـت ئەبیـتە ئەرکیکـی نیشـتیمانی پیــرۆز ، بمبــات بەرە و بەنــدیخانە یــاخود بەرە و سیســەمی پیــاوێکی گرنــگ یەك شـــتە ، لە هەردوو حــاڵەتەکەدا ئەو بە ریــزەوە ئەرکــی پیــرۆزی نیشـــتیمانی جیبەجــی دەکــات ، لەوانەشـە تاوانی کوشـتن ببیتە پـاڵەوانیتی ، هەروەك لە پێنـاو ئەرکی نیشتیمانی دوور نـیە سـۆزانی ملـوانکەی ریـز لێنـانی پیٚ نەبەخشریت .
من چـوونم بـۆ هەردوو لا رەت دەکـردەوە ، جەســتەم مـوڵکی خـۆمە . بەڵام خـاکی نیشـتیمان مـوڵکی ئەوانە ، جـاریکیش بەهۆی رەتکـردنەوەم بـۆ یەکێکیـان بـرام بـۆ بەنـدیخانە منـیش پــاریزەریکی گەورەم بە پــارەیەکی زۆر گــرت و لە بەنـــدیخانە

هاتمە دەرەوە ، پاش ئەوەی دادگا بریاریدا کە من ئافرەتێکی بە رەوشت و بەریزم . ئەنجا زانیم کە رەوشت و ریز هەمیشە پێویستی بە پارە و پولێکی زۆرە ، دەستکەوتنی پارە و پولێ زۆریش پێویستە مرۆڤ رەوشتی بۆ لە دەست بدات ، دەستکەوتنی رەوشتیش پێویستی بە پارەیە ، بەم شێوەیە ئەم هاوکیشەیە بە بەردەوامی لە بازنەیەکی بەتاڵی داخراودا دەسوریتەوە .

تەنها ساتێکیش هەستم نەکردووە من ئافرەتێکی بی ریزم . دەمزانی کە کارەکەم لە دەستکردی پیاوانیکە کە دەستیان گرتووە بەسەر ئەم دونیا و ئەو دونیاشدا . هەر پیاوانیش وا لە ئافرەتان دەکەن جەستەیان بفرۆشن بەرامبەر بریك پارە ، هەروەك هەرزانترین ئافرەتان ئەو ئافرەتانەن کە لە ژیانی هاوسەریتیدان لەگەڵ پیاواندا .

پێویستە هەموو ئافرەتان سۆزانی بن بە شێوەی جۆرا و جۆر و لەبەرئەوەی من ژێر و چاو کراوەم بریارمداوە و وام بە باشزانی کە سۆزانیەکی ئازاد بم وەك لەوەی بەد رەوشتێکی کۆیلە و دەستبەسەر بم ، لە هەر جاریکیشدا جەستەم دەدا پارەیەکی زۆرم دەست دەکەوت ، دەتوانم بەو سامانەی پێکەوەم ناوە خزمەتکار و بەردەستێکی زۆر بەکری بگرم تاکو جلوبەرگم بۆ بشۆرن و پێڵاوەکانم پاك بکەنەوە ، هەروەك دەتوانم پاریزەر بگرم بۆ بەرگری کردن لە ( ناموسم ) ، پزیشك بۆ لەبار بردنی سکەکەم ، ڕۆژنامەنووس بەکری بگرم تاکو وینە و هەواڵەکانم بلاو بکاتەوە . هەموو شتێک نرخیکی هەیە و هەموو کاریکیش کری ، کریش زیاد دەکات بە پێی بەرز بوونەوەی کارەکە ، هەروەك نرخەکە زیاد دەکات

بە پێی سەرکەوتنی ئەو کەسە بە پلیکانە کۆمەڵایەتیەکاندا ، ڕۆژیکیان بریك پارەم بەخشی بە یەکێک لە کۆمەڵە خیر خوازیەکان بینیم ڕۆژنامەکان وینەکەمیان بڵاو کردۆتەوە و ئاماژەیان بە هەڵوێستی نیشتیمانیم دابوو ، وام لێهات هەر کە پێویستم بە بریك لە ( ناموس ) یا ناوبانگ بوایە بریك پارەم لە بانك رادەکێشا .
بەڵام لوتی پیاوان بە شێوەیەکی سەیر بۆنی پارە و پول دەکات ، پیاوێک داوای کرد شووی پێ بکەم بەڵام رەتم کردەوە ، چونکە هێشتا شوێنەواری شەق و پێڵاوی مێردەکەم بە جەستەمەوە ماوە ، پیاوێکی تر داوای خۆشەویستی لێکردم ئەویشم رەتکردەوە چونکە لە ناخمدا ئازاری بە سۆی هێشتا شوێنەواری ماوە .
وامزانی کە رزگارم بووە لە دەست پیاوان ، بەڵام ئەم پیاوەی ئەمجارە هاتە لام یەکێک لەو کارانەی بە دەست بوو کە هەر بە پیاو دەکریت و کاری ئەوانە ئەویش ( گەوادی ) بوو ، وا هەستمکرد بە بریك پارە لێم دوور دەکەویتەوە هەروەك کابرای پۆلیس . بەڵام ئەو پارەکەی رەتکردەوە و سوور بوو لەسەر ئەوەی لە قازانجدا بەشداریم لەگەڵ بکات و پێ وتم : هەموو سۆزانیەك گەوادیکی لە پشتە کە لە گەوادەکانی تر و پیاوانی پۆلیس دەیپاریزیت ، من پاریزگاری لە تۆ دەکەم . پێموت : خۆم پاریزگاری لە خۆم دەکەم . وتی : ئافرەتێک نیە لەسەر گۆی ئەم زەویە پاریزگاری لە خۆی بکات . وتم : پاریزگاری تۆم ناویت . وتی : پاریزگاری دەسەپێنریت گەر نا ئەوا پێشەی مێرداری و گەوادی نەدەما . وتم : هەرەشە قبوڵ ناکەم . وتی : من هەرەشە ناکەم ، ئامۆژگاری دەدەم .

وتم : گەر قایل نەبووم بەو ئامۆژگـاریە ؟ وتـی : ئەوکـات ناچـار دەبـم هەرەشــە بـکەم . وتـم : ئەی چـۆن هەرەشــەم لـێ دەکەیـت ؟ وتـی : ڕی و شـوین و پێداویسـتی خـۆم هەیە و هەر کارەش پێداویستی خۆی هەیە .
پەنام بردە بەر پۆلیس ، بەڵام بینیم پەیوەنـدی لەگەڵ پـۆلیس لەمن چرترە . پاشان هانام برد بۆ یاسـا ، بـۆم دەرکەوت یاسـا سزای ئافرەتان دەدات و چاو لە پیاوان دەپۆشریت .
ئەنجا ئەم گەوادەی ناوی ( مرزوق ) بوو بینیم لە دوورەوە پـێم پێدەکەنیت کاتێک سەرنجی دەدام ویڵ بووم بە دوای شـتێکدا بمپاریزیـت دواتـر بینیمـی خـۆم کـردەوە بە مـاڵەوەدا ، دوام کەوت ویستم دەرگاکە بدەم بە دەم و چاویدا ، چەقـۆیەکی لە گیرفـانی دەرهێنـا و هەرەشــەی لێکـردم و لە دوامەوە هـاتە ژوورەوە . پێمــوت : چیــت لــێم دەوی ؟ وتــی : دەمەویــت پاریزگاریت لـێ بـکەم . وتـم : هـیچ کەسـێک هەرەشـەم لـێ ناکـات لە تـۆ زیـاتر ! وتـی : گەر مـن هەرەشـەت لـێ نەکەم پیاوانی تر هەرەشـەت لێ دەکەن ، چـونکە گەوادەکـان زۆرن ، گەر دەشتەوی شووم پێ بکەیت قایلم .
وتم : پێویست ناکات ، پارە و سـامانم بەرە ، بەڵام جەسـتەم موڵکی خۆمە . بە زمـانیکی پیـاوانی سـەرکەوتوو وتـی : مـن کـابرایەکی ســەرقاڵم ، ســەرمایەم جەســتەی ئافرەتــانە ، منــیش کــار و خۆشـەویســتی تــێکەڵ نــاکەم . پێمــوت : خۆشـەویستی دەناسیت ؟
وتــی : ئایــا مــرۆڤ هەیە خۆشـەویســتی نەناســیت ؟ تــۆ خۆشـەویستیت ناسیوە ؟ وتم : ناسیومە . وتی : ئەی ئێسـتا لە کوییە ؟ وتـم : نادیـارە . ئەی تـۆ ؟ وتـی : هەرمـاوە . وتـم:

ئەی داماو ! . وتی : ویستم لە دەستی رزگارم بیت بەڵام نەمتوانی . وتم : ئافرەتە یا پیاو چونکە گەوادەکان هەمیشە پیاو بەباشتر دەزانن ! وتی : ئافرەتە . وتم : پارەی بۆ خەرج دەکەیت ؟ وتی : هەموو شتێکی دەدەمی ، پارەم کۆششم خودی خۆم جەستەم بیرم ، هەموو شتێک لەگەڵ ئەوەشدا هەست دەکەم بەشی ناکەم ، پیاوێکی تری خۆشدەویت . وتم : ئەی داماو ! وتی : هەموو خەڵکی داماون لە خۆشەویستیدا . پێکەنیم و وتم : من داماو نیم چونکە کەسم خۆشناویت . سەرنجیکی چاوەکانیدام و وتی : خەیاڵت خاوە چونکە من لە چاوانتدا ئەو زریانە دەبینم کە پاشماوەی داروخانی خۆشەویستیە . وتم : خۆشەویستی چاوان پر دەکات لە روناکی نایروخینیت . وتی : ئەی داماو .. تۆ نەتزانیوە خۆشەویستی چیە ؟ من پیتی دەناسینم ! .
ویستی رامکیشێت بۆ لای خۆی پاڵیکم پێوە نا و وتم : من خۆشەویستی و کار تێکەڵ ناکەم ! . وتی : کی وتویەتی ئەمە خۆشەویستیە ؟ ئەمە بەشیکە لە کار . وتم : مەحاڵە . وتی : هیچ شتێک نیە لای من ناوی مەحاڵ بیت . زانیم گەوادیکی سامناکە و دەستی گرتووە بەسەر ژمارەیەك لە ئافرەتانی سۆزانی کە من یەکێکم لەوان ، هاوریشی لە هەموو جێگەیەك هەیە پارە و پولێکی باشیان بۆ خەرج دەکات ، هاورییەکی پزیشکی هەیە پەنای بۆ دەبات گەر هاتوو یەکێک لە سۆزانیەکان سکی کرد . هەروەك هاورییەکی تری هەیە لە پۆلیس دەیپاریزیت لە بەسەردا دانی یەکەکانی پۆلیس ، هاوریی هەبوو لە دادگا سەرجەم بەندەکانی یاسای بۆ شی دەکردەوە کە دەیپاراست و هەر سۆزانیەك

بگیریـت ئـازاد دەکریـت یـاخود ( غەرامە ) بـدریت و بە زوتـرین کات لە بەندیخانە بیـتە دەرەوە بـۆ ئەوەی زۆر دوا نەکەویـت لە ئەنجامدانی کارەکەیی و بەرهەمەکەی .
پاشـان زانـیم مـن ئـازاد نـیم وەك وا هەسـت دەکەم بەڵکـو بریتیم لە ئامیریکی جەستەیی شەو و ڕۆژ کار دەکەم لە پێنـاو ئەوەی چەند پیاوێک بەبێ سنوور دەوڵەمەند بـکەم . تەنـانەت ئەو خانوەشـم لە دەسـتدا کە هەموو هێـز و توانـام تیـادا دانـا ، ڕۆژێك لە ڕۆژان بەخۆم وت چیتر بەردەوام نابم ، هەموو کـاغەز و پێداویسـتیەکانم کـردە جانتـا بچکـۆلانەکەم و خەریکبـوو لە دەرگاکە بچمە دەرەوە ، کتوپڕ هاتە بەردەمم و وتی : بـۆ کـوی دەچیت ؟ وتم : دەگەڕیم بەدوای کاریکدا ، هێشـتا بروانـامەی قوتابخانەم پێ مابوو.
وتی : کی وتویەتی تـۆ کـار ناکەیـت ؟ وتـم : ئەو کـارە دەکەم کە خۆم هەڵیدەبژێرم . وتی: کی پێی وتوی کەسێک هەبیـت لەسـەر ئەم گۆی زەویە ئەو کارە بکات کە خۆی هەڵیبژاردبیـت ؟ وتم : نامەویت کـۆیلە و دەستبەسـەری کەس بـم ؟ وتـی : کی پێ وتوی کەسێک هەبیت لەسـەر گۆی ئەم زەویە کـۆیلە و دەستبەسەری کەسێکی تر نەبێت ؟
فردۆس خەڵکی دوو جۆرن سـیهەمیان نـیە : کـۆیلە و گەورە ! وتـم : کەواتە دەمەویـت گەورە بـم نەك کـۆیلە . وتـی : چـۆن دەبیـت بە یەکێـک لە گەورەکـان فـردۆس ؟ ئـافرەت بە تەنهـا ناتوانیت ، چ جای گەر بیت و ئافرەت بیت و سـۆزانیش بیـت لە هەمان کاتدا ؟ ئایا تۆ ئەمە بە مەحاڵ نازانیت ؟
ویسـتم بچـمە دەرەوە بەڵام پـاڵیکی پێـوە نـام و دەرگـاکەی داخسـت . چاوم بریـیە چاوی و پێموت : ئەچـمە دەرەوە ! وتـی

: نــاچیتە دەرەوە . هێنــدەی تــر چــاوم بــرییە چــاوی ، زانــی هێنــدەی ئــافرەت قینــی لە پیــاوە قیــنم لێیەتــی ، هێنــدەی کـۆیلەیەك قینـی لە گەورەکەیەتـی قیـنم لێیەتـی و چـاوەرییم ناویـــت ، لە تێروانینـــی چـــاوی زانـــیم ، هێنـــدەی گەورە لە کۆیلەکەی دەترسیت لێم دەترسیت ، هێندەی ترسی پیاوێـک لە ئافرەت لێم دەترسیت .
بەڵام هەر چەند چرکەیەك ، چاوی بز و نیر کردەوە و خۆی کـۆ کردەوە و دەرگاکەم گرت تا بـیکەمەوە ، دەسـتی بەرز کـردەوە زللەیەکــی لێــدام ، منــیش بە هەمــوو توانــام دەســتم بەرز کردەوە و زللەیەکم لێدا ، چاوی سـوور هەڵـگەڕا دەسـتی بـرد بــۆ گیرفــانی تــا چەقــۆ دەربهینیــت ، بەڵام دەســتی مــن لە دەســتی ئەو خێراتــر بــوو چەقــۆکەم کــرد بە گەردنیــدا . لە گەردنیم دەرهێنا کردم بە سنگیدا ، لە سنگیم دەرهێنـا کـردم بە ورگیدا.
چەقــۆم لە هەمــوو بەشـــەکانی جەســـتەیدا ... ئاســـانی جووڵەی دەسـتم لە وەشـاندنی چەقـۆکە بەلاوە سـەیر بـوو ، ئەوەی زیاتر سـەرسامی کردبووم کە پێشتر ئەنجـامم نەدابـوو ویســـتم بــزانم بــۆچی پێشـــتر ئەنجــامم نەداوە ، زانــیم کە دەترســـام ، ئەو ســـاتە تــرس بەرچــاوی بەردام کە ترســـم لە چاوی ئەودا بینی .
دەرگــاکەم کــردەوە و چــوومە سـەرشـــەقام ، جەســـتەم زۆر ســـوکەڵە بـــوو وەك پەریـــك وەك ئەوەی کە ئەو قورســـیەی جەسـتەم ترسـی چەنـدین سـاڵ بوبیـت کـۆ بـوبیتەوە . نیـل سحراویە و هەواش خـاوینە سـەرم بەرز کردبـۆوە بـۆ ئاسـمان لە کاریگەری پسـاندنی پەردە و دەرخسـتن و ئاشـکرا کردنـی

نادیار و شـاراوە ، تەقەی پێڵاوەکانیشـم دریـان بەبـێ دەنگـی ئەو شـــەوە دەدا بە هەنگاونـــانیکی یەك لە دوای یەکـــی بەردەوامی ئارام هیچ شتێک پەلەی لێ ناکـات ، لەبەرئەوەی پێی ئافرەتێکی دڵنیـایە لەخـۆی کە ریـگەی خـۆی شـارەزایە و ئامانجیشـی دەزانیت .
پێڵاوەکانی لە چەرمی گرانبەهایە ، پاژنەکانی بەرز و پـتەون ، قاچەکانی خر و پر و بەرزە میینەییەکی نەرمە هەرچـی بڵیـی موو پێوەی نیە و لێکراوەتەوە .
هیچ کەس ناتوانیت بە ئاسانی بمناسـیتەوە . چـونکە مـن لە ئـافرەتێکی بەریـز و گرنگـی چیـنە باڵاکـان دەکەم . قـژم لای ئارایشتگای تـایبەتی ئارایشـتکردنی ئافرەتـانی چیـنە باڵاکـان چاك کـراوە . لێوەکـانم بە رەنگیکـی ئاسـایی و سروشـتی بە رەوشتانە رەنگ کراوە ، چاوەکانم بە چەند هیڵیکی ویسـتن و رەتکـــردنەوە نەخشـــینراوە ، وەك هەر هاوســـەریکی فەرمانبەریکی باڵای چینە باڵاکان .
بەڵام بەو شێوە هەنگاونانە دڵنیایانەی سـەر شـەقامەکە ئەوە پێشـاندەدا کە من خیزانی هیچ کەسێک نیم .
بەلای چەنـــد پۆلیســـیکدا تیـــپەریم بەڵام هیچکامیـــان نەیانناسـیمەوە لەوانەیە وا تیگەیشـتبن کە مـن یەکێـک بـم لە شـازادەکان یان پاشـاکان یا خوداکان . گەر نـا ئەبـی ئەمە کـی بیت وا سـەر بەرزانە و بە فیزەوە هەنگـاو دەبیـت ؟ ئەبـی کـی بیـت بەو شـێوەیە پـێ لە زەوی گیـر بکـات ؟ بە بەردەوامـی سـەرنجیان دەدام منیش پێویسـت بوو لەسـەرم هیچ خۆم تێـک نەدەم و سـەرم لە ژیانی نزمی ئەوان بەرزتر بکەمەوە .

هەوڵ بدەم ئارامی و ساردیم راگرم ، هەنگاوی پتەو و جێگیر بنیم . ئەوان چاوەروانی ئەوە دەکەن یەکێک لە ئیمە هەڵە بکات و هەڵبکوتنە سەری .
لەسەر کۆتایی کۆڵانەکە ئوتومبیلێکی عەنتیکەم بینی سەری پیاوێکی بە پەرۆشی لێوە هاتە دەرەوە . دەرگاکەی بۆ کردمەوە و وتی : وەرە لەگەڵم . وتم : نەخیر . وتی : چەند دەڵیی دەتدەمی . وتم : نەخیر . وتی: بروام پێ بکە چەند بڵیی دەتدەمی . وتم: تۆ ناتوانیت نرخم بدەیت لەبەرئەوەی زۆر گرانە . وتی : دەتوانم هەر نرخیك بدەم چونکە من شازادەیەکی عەرەبیم . وتم : منیش شازادەم . وتی : هەزار دەدەم . وتم : نەخیر . وتی : دوو هەزار . چاوم برییە چاوی بەو ترسە شاراوەیەی لە قوڵایی چاوەکانیدا هەستم پێکرد زانیم یەکێکە لە شازادەکان یا فەرمانرەواکان . بۆیە پێموت: کە سی هەزار . وتی : قایلم.
لەسەر جێگە نەرمەکە ، چاوم نوقاند و جەستەم لەخۆم جیا کردەوە ، جەستەیەك هێشتا گەنجە و پتەوە توانای کشانەوە و بەرگری کردنی هەیە ، پاشان هەستم بە کیشی قورسی جەستەی کرد هاتە سەر جەستەم و سەر سنگم ، پتەوی چەندین ساڵی پێوە بوو ئاو و عەرەقیکی زیاد لە پێویست . لە هەموو جوڵەیەکدا بە گیلیەکەوە لێی دەپرسیم : هەست بە چێژ دەکەیت ؟ منیش چاوەکانم دەنوقاندوو دەموت : بەڵێ . ئەویش زیاتر دڵخۆش دەبوو و جووڵەی زیادی دەکرد.
دووبارە لێی دەپرسیمەوە هەمان پرسیار منیش بە بەڵێ وەڵامم دەدایەوە هێندەی تر دڵخۆش دەبوو ، دواجار کە لێی پرسیم بە تورەییەکەوە وتم : نەخیر ، پاشان کاتێک پارەکەی

دامــی هێشــتا مــن هەر تــورە بــووم ، پــارەکەم وەرگــرت یەکە یەکە کاغەزی پارەکەم دەدراند .
بەرکەوتنــی کــاغەزی پــارەکە بە پەنجەکــانم لە بەرکەوتنــی یەکەمــین ( قــرش ) دەچــوو کە بــۆ یەکەمجــار لە بــاوکمم وەرگــرت ، بە هەمــوو توانــام پارەکــانم دەدرانــد وەك ئەوەی پارەی مامم و پارەی مێـردەکەم و بـاوکم بـدرینم ، وەك ئەوەی مەرزوق و بەیـــومی وضـــیاء و ئیبـــراهیم بـــدرینم ، ســەرجەم ئەو پــارانە بــدرینم کە لـێم وەرگرتــوون و لەگەڵیــدا پەنجەکانم بدرینم .
چاوەکــانی بەســەر ســورمانیکەوە زەق بــوون کاتێــک بینیمــی پارەکان دەدرینمم وتی : بەڕاستی تـۆ شـازادەیت ! چـۆن هەر لە سەرەتاوە بروام پێ نەکردیت ؟ وتـم : شـازادە نـیم وتـی : وامزانی سۆزانیت .
وتم : سۆزانی نیم ، بەڵام مامم و بـاوکم و مێـردەکەم هەر لە سەرەتاوە هەوڵیان لەگەڵدام تاکو بـبمە سـۆزانی . شـازادەکە پێکەنی و وتـی : تـۆ درۆ دەکەیـت ، لەبەرئەوەی دەم و چـاوت دەڵێت کە تۆ کچی پادشایت .
وتم : باوکم هیچ جیاوازییەکی ئەوتـۆی نەبـوو لەگەڵ پادشــادا لە یەك شــتدا نەبێــت . وتــی : ئەو شــتە چــیە ؟ وتــم : فیــری کوشتنی نەکردم ، لێم گەڕا خۆم بە تیپەربوونی کات لە ژیانـدا فیر ببم . وتی : ئایـا ژیـان فیـری کوشــتنی کردوویــت ؟ وتــم : بەڵێ . وتی : کەست کوشتووە ؟ وتم : بەڵێ.
چــاوی بــریە چــاوم و پێکەنــی ، وتــی : نــاتوانم بــروا بــکەم کەسێکی وەك تۆ بتوانێت کەس بکوژیت .وتم : بـۆچی ؟ وتـی : لەبەرئەوەی ناسکیت . وتم: کـێ دەڵـێ کوشـتن پێویسـتی

بە ناسکی نیە ؟ جاریکی تر چاوی بریبە چاوم و پێکەنی و وتی : هەرگیز بروا ناکەم تۆ بتوانێت میشولەیەك بکوژیت .
وتم : لەوانەیە میشولە نەکوژم بەڵام پیاو دەکوژم . جاریکی تر سەرنجی چاویدام و وتی: بروا ناکەم . وتم : چی بکەم تا بروام پێ بکەیت ؟ وتی : نازانم ، چی دەکەیت تا بروات پێ بکەم ، بە هەموو توانام دەستم بەرز کردەوە و زللەیەکم لێدا وتم : بروات کرد کە لێمدایت ؟ لێدانی چەقۆیەك و گیر کردنی لە گەردنت لە جووڵەی ئەم زللەیە ئاسانترە...
چاوەکانی زەق بوو و سەیری ئەکردم بە ترسیکەوە . پێموت : ئێستا بروا دەکەیت کە دەتوانم بتکوژم ؟ چونکە تۆ تەنها وەك میشولەیەك وایت بە هەزاران لە پارەی میللەتە برسیەکەت لە سۆزانیەکاندا خەرج دەکەیت .
پێش ئەوەی دەستم بەرز بکەمەوە تا زللەیەکی تری لێ بدەم ، وەك چۆن ئافرەتان داوای فریاکەوتن دەکەن ، هاواری کرد فریام کەون ، هێندەی هاوار کرد تا پیاوانی پۆلیس هاتن بە دەنگیەوە . پێی وتن : بیگرن ! ئەوە بکوژیکی تاوانبارە . لێیان پرسیم : ئایا تۆ بکوژیکی تاوانباریت ؟ وتم : من بکوژم ، بەڵام تاوانبار نیم . منیش وەك ئیوە وام تەنها تاوانباران دەکوژم . وتیان ئەم پیاوە شازادەیەکی پاڵەوانە و تاوانبار نیە . وتم : پاڵەوانیتی شازادە و پادشاکان لای من تاوانە ، من وەك ئیوە نیم . وتیان : تۆ تاوانباری کچی تاوانباریت .
وتم : دایکم تاوانبار نەبوو ، هیچ ئافرەتێک ناتوانیت ببیت بە تاوانبار ، چونکە تاوان پێویستی بە نیری و نیرینەیی هەیە . وتیان ئەوەدەڵێی چی ؟ . وتم : ئیوە تاوانبارن باوکان مام و خاڵ و مێردەکان و گەوادەکان و پاریزەران و پزیشکان

ڕۆژنامەنووسەکان و سەرجەم پیاوان لە سەرجەم پێشەکاندا لە ئیوەن . وتیان : تۆ ئافرەتێکی ترسناك و درندەیت .
وتم : لەبەرئەوەی ڕاستیم ووت ؟ ڕاستیش درندە و ترسناکە , ئاسنیان کردە دەستم و بەرەو بەندیخانە راپێچیان کردم ، دەرگا و پەنجەرەکانیان لەسەر داخستم . من دەمزانی بۆچی هێندە لێم دەترسن . چونکە من تاکە ئافرەتێکم کە پەردەم لەسەر ڕاستیە شاراوەکەیان هەڵماڵیوە ، دادگاییان کردم و سزای لە سێدارەدانیان سەپاند بە سەرمدا لەبەر ئەوە نا کە من کەسێکم کوشتبوو ، چونکە ڕۆژانە چەندین کەس دەکوژریت ، دەیانزانی گەر بژیم دەیانکوژم . ژیانی من یەکسانە بە مردنی ئەوان ، مردنیشم واتە ژیانی ئەوان ، ئەوان حەز بە ژیان دەکەن ، چونکە ژیان لای ئەوان واتە تاوانی زیاتر و دەستکەوتی زیاتر .
بەڵام من بەسەر هەریەك لە ژیان و مردندا سەرکەوتم ، لەبەرئەوەی چیتر حەزم لە ژیان نیە و لە مردنیش ناترسم . حەزم لە هیچ نیە و بە هیوای هیچ نیم و لە هیچیش ناترسم ، چونکە من ئازادم .
هیچ شتێک نیە لە ژیانماندا بمانکاتە کۆیلە و دەستبەسەر حەز و هیوا و ترسی خۆمان نەبێت ، سەربەستیم تورەیان دەکات و دەیانەویت لە ریگەی شتێکەوە کە لێی بترسم یا حەزیك حەزی لێ بکەم یاخود لە ریگەی هیوایەکەوە کە لە ئاسۆوە خۆیم نیشان بدات دەستبەسەر و کۆیلەم بکەن .
جارێکیان پیاوێکیان هاتە لام و پێی وتم : هیوای ئازاد بوونت هەیە گەر ئەم داوای لێبوردنە ئیمزا بکەیت بۆ سەرۆکی

دەوڵەت . وتم : حەزم لە ئازاد بوون نیە لە تاوانەکەم چونکە تاوانەکەم تاوان نەبوو . وتی : تۆ پیاوێکت کوشتووە .
وتم : گەر جاریکی تر بیمەوە ژیانتان واز لە کوشتن ناهینم ، ئیتر ئایا ئەم نوسراوە ئیمزا بکەم هیچ سودیکی دەبیت ؟
وتی : مافی خۆتە بکوژرییت ئەی تاوانبار . وتم : هەموو خەڵکی دەمرن وا باشترە من بە تاوانەکەی خۆم بمرم تا بە تاوانی ئیوە . ئێستاش من چاوەروانیانم ، پاش کەمێکی تر دین و دەمبەن . سبەی بەیانی لێرە نابم ، هەروەك لە هیچ جێگەیەك نابم کە کەسێک بیزانیت . ئەم گەشتە بۆ جێگەیەکە خەڵکی لێی بی ئاگان بە فەرمانرەوا و پادشاکانیشەوە ، زۆرم پێخۆشە.
من بەدوای شتێکدا دەگەڕام کە شادمانم بکات ، شتێک سەرم بەرز بکاتەوە بەسەر هەموو خەڵکی و بە تایبەت فەرمانرەوا و پادشا و کاربەدەستان . ڕۆژنامە نەبووە نەیگرم بە دەستمەوە و کاتێک گەر وینەی پیاوێکی تیدا بووبیت تفم نەکردبیتە سەر دەم و چاوەکەی .
من دەمزانی کە تف کردنە سەر ئەو وینانە ، تەنها تف کردنە سەر کاغەزی ئەو ڕۆژنامانەیە کە سوودم لیێ وەردەگرتن لە راخستنیان لە ناو کاوانتەر و سەر میزەکاندا ، لەگەڵ ئەوەشدا هەر تفم دەکردوو لێی دەگەڕام تا خۆی ووشك دەبوەوە .
هەرکەس منی ببینیایە کە ئەو تفەم دەکردە سەر ئەو وینەیە وایدەزانی خاوەنی وینەکە دەناسم ، بەڵام من نەمدەناسی ، چونکە من تەنها ئافرەتێکم ، ئافرەتێکیش ناتوانیت هەموو ئەو پیاوانە بناسیت کە ڕۆژنامەکان وینەکانیانی بڵاو دەکردەوە

. هەرچی بم من تەنها لە سۆزانیەکی سەرکەوتوو زیاتر هیچی تر نیم ، هەروەك هەرچەند سۆزانی سەرکەوتوو بیت ناتوانیت هەموو پیاوان بناسیت ، هەر پیاوێکیش کە بینیبیتم ویستوومە زللەیەکی لیّ بدەم ، بەڵام نەمدەویرا و دەترسام ، ترس ئەم کارەی لا قورس کردبووم .
نەمدەزانی ئەو ترسە لە خۆم دەربکەم تا بۆ یەکەمجار دەستم بەرز کردەوە بەرز بوونەوەی دەستم و داگرتنی ترسەکەی شکاندم و زانیم کە زۆر ئاسانە ، چیتر دەستم نەدەوەستا لە بەرز بوونەوە و لێدانی زللە لە هەر یەکێکیان ، جووڵەی دەستیشم زۆر ئاسان و سووك بوو ، هێندە ئاسان و سووك بوو گەر چەقۆش بوایە و لە سنگم گیر بکردایە هەروا دەبوو ، بە ئاسانی و بە ڕاستی ئەم ڕاستیە دەڵێم ، چونکە هەمیشە ڕاستی سووك و ئاسانە ، لە ئاسانیەکەشیدا ڕەقی و توندی بەدی دەکریت . من نەمتوانی بەو ڕەقی و توندیە بگەم دوای ساڵانیکی دوور و درێژ نەبێت لە تێکۆشان . بە دەگمەن مرۆڤ دەگات بە ڕاستی ترسناك دوای ساڵانیکی کەم . گەیشتن بە ڕاستی واتە مرۆڤ چیتر ناترسیت لە مردن . چونکە ڕاستیش وەك مردن وایە پێویستی بە ئازایەتیەکی زۆرە . ڕاستیش وەك مردن وایە دەکوژیت .
منیش کوشتنم بە ڕاستی ئەنجامدا نەك بە چەقۆ . هەر ئەم هۆیەشە ترساندونی و پەلە دەکەن لە لەسێدارە دانم . ئەوان لە چەقۆ ناترسن بەڵکو ڕاستی دەیانپەشۆکینیت .
ئەم ڕاستیە ترسناکە هێز و توانای زۆری پیّ دەبەخشیم ، وام لێدەکات لە مردن نەترسم لە ژیانیش ناترسم ، هەروەك

لە برسـیتی و رووتـی و روخـانیش ناترسـم ، لە درنـدەیی فەرمانرەواکـان و پیـاوانی پۆلیسـیش ناترسـم ، بە ئاسـانیش تف دەکەمە سـەر دەم و چاوە درۆزنەکان و ڕۆژنامە سـاختەکان ! .
پاشـان لە پـر دەنگـی فـردۆس نەمـا وەك چـۆن لە خەونـدا دەنگێک نامینیـت . جەسـتەم جوڵانـد وەك یەکێـک چـۆن دوای خەوتن خۆی دەکیشێتەوە ، بەڵام ژێرم سیسـەم نەبـوو بەڵکـو شـتێکی ڕەق بـوو وەك ڕەقـی زەوی و سـارد وەك سـاردی زەوی بەڵام سـاردیەکە ناگـات بە جەسـتەم ، وەك سـاردی دەریـا وایە لە خەونـدا تیایـدا مەلە دەکەم و رووتـم سـەرمام نابیت و نوقمیش نابم ، لەگەڵ ئەوەشدا کە مەلە نازانم .
دەنگی پچرا بەڵام دەنگە هێمنەکەی لە گوێمدا دەزرنگـایەوە ، وەك ئەو دەنگانە وابوو کە لە خەوندا دەیانبیستین .
وا هەستم کرد لە دوورەوە دیت لەگەڵ ئەوەی کە نزیـك بـوو ، یان لە نزیکەوە دیت لەگەڵ ئەوەی دوورە ، نـازانین بە ڕاسـتی لە کویوە دیت : لە سـەرەوە یـان لە ژێـرەوە ، لە ڕاسـتەوە یـان لە چەپەوە ، لەوانەشـە وا هەسـت بکەیـت کە لە نـاخی زەویەوە دیتە دەرەوە ، یـا لە دڵـی ئاسـمانەوە ، لەوانەشـە لە هەموو لاکانەوە بۆمان بیت ، وەك هەوایەك گوێچکە پر بکـات . بەڵام هەواش نەبێـت ، بەڵکـو دەنگێکـی ڕاسـتەقینە بـوو مـن گـوێم لێبـوو ، ئـافرەتێکی ڕاسـتەقینەش لە گۆشـت و خـوین هێشـتا لە بەردەممدا لەسـەر زەویەکە دانیشتووە ، پەنجەرەی ژووری بەنـدیخانەکەش داخـراوە ، دەرگـاکەش داخـراوە نابیـت خەون بیـت پێویسـتە مـن بە ئاگـا بـووبم . چـونکە لە ناکـاو دەرگاکە کرایەوە و ژمارەیەك پۆلیسـی چەکـدارم بینـی هـاتنە

ژوورەوە ، بازنەیەکیان بە دەوردا کێشاو گوێم لێبوو یەکێکیان پێی وت : هەستە .. کاتت هاتووە !

لەگەڵیان رۆیشت . بەیەکجاری لەبەرچاوم وون بوو ، بەڵام دەنگەکەی لە گوێمدا هەر دەزرنگایەوە ، گوێم و میشکم و بەندیخانە و شەقامەکانی دەشڵەقاند ، جیهانی دەشڵەقاند .

دەبووە هۆی سامناکی پەیدا کردن لە جیهاندا ، ترسناکی ڕاستی کوشندە ، سامناکی ڕاستەقینەی درندەی ئاسان ئاسانی مردن ، ئاسانی منداڵێك درۆ نازانیت . لەبەرئەوەی کە سەرجەم جیهان درۆ دەکات پێویست بوو لەسەر فردۆس کە نرخی گران لەسەری بکەوێت .

ئەنجا سواری ئوتومبیلەکەم بووم سەرم کاس ، خەڵکیم بینی بە پەلە بوون لە رۆیشتنیان بە شەقامەکاندا بەرە و ساختە و درۆکانیان ، ڕۆژنامەکانم بینی بە کتێبخانەکانەوە هەڵواسرابوون پر بوون لە ناونیشانی درۆ ، ئاڵا ساختەکانیش لە هەموو جێگەیەك بەرز کرابوونەوە .

بە هەموو توانام پێم لە بەنزینی ئوتومبیلەکەم گیر کرد وەك پێ بنیم بە هەموو جیهاندا پاشان پێش ئەوەی ئوتومبیلەکەم راگرم و بەر جیهان بکەوم بۆم دەرکەوت و زانیم کە فردۆس لە من ئازاتر بووە .

# WOMAN AT POINT ZERO



## نامەی د.نەوال سەعداوی بۆ وەرگێڕ

د. نوال السعداوي
جمعية تضامن المرأة العربية
ذات وضع استشاري لدى
المجلس الاقتصادي الاجتماعي بالأمم المتحدة

قوة النساء
التضامن
رفع الحجاب عن العقل

ARAB WOMEN'S SOLIDARITY ASSOCIATION
In Consultative Status - Category II
with the United Nations Economic
& Social Council

القاهرة ٤ نوفمبر ٢٠٠٠

فاكس رقم
٠٠٤٤١٧٠٧٦٤7722

إلى الأستاذ: جهنيار كمال جلال

تحياتي وتقديري

أسعدني كثيراً أن أعرف أن بعض مؤلفاتي الأدبية والعلمية قد ترجمت ونشرت باللغة الكردية، وأشكرك على إرسال نسخة من كل كتاب إليّ،

إن سعادتي كبيرة أن أعرف أن الأخوات والإخوة في كردستان العراق يقرأون لي بلغتهم الأصلية، وكم أود أن أتعلم الكردية لأقرأ ما يكتبه النساء والرجال في كردستان

مع اعتزازي وتقديري

نوال السعداوي

... Shoubra Gardens 11241, Cairo, Egypt.